ناوی کتێب: « مرۆڤ ... مەخلووقە شکۆمەندەکە »

نووسەر: عەبدولقەهاری شێخ ( کاکە شێخ )

نەخشەسازی بەرگ: ( رمضان عبداللّٰه )

سەرپەرشتیاری چاپ: نەهرۆ مەحمود

نۆرەو ساڵی چاپ: یەکەم ٢٠١٤ زایینی

نرخ: ( ٧٠٠٠ )

تیراژ: ( ١٠٠٠ ) دانە

ژمارەی سپاردن: ( ٢٧٦٠ )ی ساڵی ٢٠١٣ لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکانی دراوەتێ.

# پێشکەشە

*بەهەموو ئەوانەی شکۆمەندانە دەڕواننە مرۆڤ و خۆشیان شکۆمەندانە زیندەگیی دەکەن .

*بەهەموو ئەوانەی سوود لە توانا و بەهرەکانی مرۆڤبوونی خۆیان وەردەگرن و لە هەوڵدان دڵ و گیان و ژیانیان هەماهەنگی ئەو پێناسانە بکەن کە حەقیقەتی مرۆڤ و مرۆڤبوون دەیانگرێتەوە .

## چەند پێناسەیەکی کورت

## بۆ مرۆڤ و بۆ ئەم کتێبە

شکۆمەندی مرۆڤ لەم خاڵانەوە سەرچاوەی گرتووە :

١- مرۆڤ دارای ئیختیار و ئیرادەیە .

٢- مرۆڤ مەقصودی وجوودە .

٣- نمایندەی ئاسمانە لە زەوی دا .

٤- لە رووحی بەبەردا کراوەو بەهۆیەوە داهێنەرترین بوونەوەری جیهان و ژیانە .

٥- تەواوی مەخلووقات پێکهاتیان لەخەلقە و ئەمرەکەیان لەدەرەوەی خۆیانا بەسەر فەرمانکراوە و ئیتر بەپێی ئەو

ئەمرە جووڵەو وەزیفەی خۆیان ئەدا دەکەن لەگەردووندا .. بەتەنها مرۆڤە کە خەلق و ئەمری تێکەڵ بەیەکتر کراوەو ئەمرو ئیختیارو ئیرادەو ئازادیی بەخۆی بەخشراوەتەوەو چی بوێت و چۆنی بوویت وەها دەکات.

٦- توانای بیرکردنەوەی هەیە و بەهۆیەوە هەم تێڕامان لەسروشت و بوونەوەر دەکات، هەم هەڵوێستیان لەبارەوە دەگرێت.

٧- تاقە مەخلووقە خەون دەبینێت و بەهۆیەوە کتێبی ڕابردوو دەخوێنێتەوەو سەیری سیناریۆی ئایندە دەکات.

٨- چەشنی خاکێکی بەپیتە و زەمینەسازی هەموو چەشنە بەرهەمێکی هەیەو بۆ هەر تۆو و نەمامێک ئامادەباشە.

مرۆڤبوون:

چەندە تەشریف و ڕێزلێنانە،

ئەوەندەش

تەکلیف و، بەرپرسیارێتییە.

مرۆڤی بچووک:

دیلی ئارەزووەکانییەتی ..

مرۆڤی مەزن:

بە بیر و باوەڕ و، پەیام و، ڕەوشتەکانی،

نە هەر ئازادە ...

ئازاد کاریشە.

مرۆڤ

ئەو بوونەوەرەیە

کە لەدەرەوە ناگۆڕێت ..

دەبێ لەناخ و دڵ و دەروونەوە،

دەست بۆ چاکسازیی خۆی بەرێت.

مرۆڤی بچووک:

لەڕووبەڕووبوونەوەی نەیارەکانیدا،

هانا بۆ زمانی دەبات ...

مرۆڤی مەزن:

وەختێ نەیارەکانی ڕووبەڕووی دەبنەوە،

هانا بۆ ڕەوشت و

بۆ بێدەنگیی و

ڕاگرتنی هاوسەنگیی دەروونی دەبات.

مرۆڤ:

بە بەژن و باڵای نا ... بە تەمەنیشی نا ...

بە دڵ و دەروون و

ئیمان و ئاکار و ئەوین و ئیرادەی ..

گەورەیە.

بە تۆڵە کردنەوە

دەگەیتە سەرکەوتن و براوەیی ..

بەڵام ناگەیتە ئاسوودەیی و سەلامەتیی.

تووڕەیی:

ئەو ئاگرە بەتینەیە ..

کە بەر لەهەرشت و هەرکەس

خەرمانی ئارامیی دڵی خاوەنەکەی دەسوتێنێ.

هەندێک :

سادە بیردەکەنەوە و سادەش دەژین ..

هەندێکی تر :

قووڵ بیردەکەنەوە و ئاڵۆز دەژین ..

تۆ :

قووڵ بیرکەوە و سادەش بژی.

هۆش و بیری ڕاست و ڕەوان و ڕۆشن ...

ڕاگیری مرۆڤبوون و ،

دڵی سازگار ...

بەخشەر و پارێزەری ئارامیی ناخ و ،

ڕەوشت و ئاکاری جوان ...

سەنگی کەسایەتی مرۆڤن .

لاوازیی جەستە گرنگ نییە ..

مرۆڤ بە باوەڕ و ناخ و ئیرادەی بەهێزە ...

نەک بە شتی تر.

قارەمان کەسێکە:

هەرچەند بیانەوێ

هەر نەتوانن لە ڕێڕەوی نەرم و نیانیی لای بدەن.

مەزنیی مرۆڤە باشەكان لەوەیدایە،

دەیانتوانی باش نەبن و ... ...

باش بوون..

بچووكیی مرۆڤە خراپەكانیش لەوەیدایە،

دەیانتوانی خراپ نەبن و .....

خراپ بوون.

شکۆمەندیی مرۆڤ لە ڕەوشتی دا تەجەللی دەکات،

رەوشت: ناسنامەی مرۆڤە ...

رەوشت: دەرخەری ناخی ئینسان و

سەلمێنەری حەقیقەتی ئەوە.

دڵ:

تاقە مەملەكەتێكە ..

كە هیچ سوپایەك پێی داگیر ناكرێت

ئەگەر خاوەنەكەی نەیەوێت.

باوەڕ بێنن بەوەی

نیشتیمانێکی تر هەیە

پێی دەڵێن: نیشتیمانی دەروون ..

ئازاد کردنی ئەو

لەپێشەوەی ئازادیی خاک و وڵاتە.

ئەو مرۆڤەی

ڕێزی لەخۆی و لەتۆش گرتووە ...

ئیتر هیچ بیانووەک

لەجیاوازی بیرکردنەوەو ڕەنگ و زمان و

گەل و ئاین نییە ..

تا ڕێزی لێ نەگریت.

کوێر و کەڕ و لاڵ

ئەوانە نین، کە نابینن و .. نابیستن و.. قسە ناکەن،

بەڵکو ئەوانەن:

کە ستەمی ستەمکاران دەبینن و

ناڵەی هەژار و چەوساوانن دەبیستن و،

لەبەرامبەردا هیچ ناکەن و

هیچ ناڵێن.

لەوەی

کە لایەنگری هێمنی و ناتوندو تیژیت،

باکت بە بیر و بینشی پێچەوانەی

هیچ کەس نەبێت.

مەرج نییە گەر مەڕ نەبیت ... گورگ بیت !

یان .. گەر نەتویست وەك گورگ زیندەگیی بکەیت ،

حەتمەن مەڕ بیت ،

دەشێ مەڕ نا ... گورگیش نا ،

شوان بیت .

ئەو دیاردە و خەسلەت و هەڵسوکەوتانەی
بەچەندبارەبوونەوەو تێپەڕینی کات بەسەریاندا ،
دەبنە خوو ڕەوشت
لە دەروون و ژیان و ژینگەی مرۆڤەکاندا ..
ڕەگوڕیشاڵ لەکەسایەتی ئادەمیزاددا دادەکوتن و ،
دواتر نەهێشتن یان گۆڕینیان هەروا کارێکی ئاسان
نابێت .

بەیارمەتی
ڕەوشت و دڵسۆزی و خۆشەویستیتان ،
بڕۆنە نێو دڵی خەڵکی و
بۆ هەمیشە تیایاندا بمێننەوە .

بەچاویلکەی ترس نا ، بەخۆشەویستی ...

دەتوانی کتێبی نهێنی هەرکەسێك بخوێنیتەوە ..

بە زانین نا ، بە پارەو پووڵ و سامان نا ،

بە پلەوپایە و خێڵ و خانەوادەشت نا ،

بەڵکو بە پێنووسی ڕەوشت و کەسایەتیت ،

دەتوانی چیرۆکی گۆڕانکاریی

لە دەفتەری ژیانی هەرکەس بنووسیتەوە .

لەبنەڕەتدا هێزی ڕاستەقینە، بۆ بەرگریی کردنە لە:
ژیان و ماف و ئازادییەکان، کە بریتییە لەحەقیقەت و
شکۆمەندیی کەسەکان،
کەچی بەداخەوە لەم سەردەمەی ئێمەدا هێز:
بۆ زەوت و پێشێلکردنی مافەکان و بەزاندنی
سنوورەکان و کۆیلەکردنی مرۆڤەکانە .

ئەگەر مەحەببەت ، لەجیاتی دەرمان

بەخەڵك بدەن ،

كارێكی تەندروستیتان كردووە .

لەجیاتی ئەوەی ڕەخنە لە مرۆڤ بگرن ،

باشتر وایە لێی تێبگەن ...

تا بزانن چۆن چارەسەری ئەو دەردانە دەکەن ،

کە چەشنی نەخۆشییەکی کوشندە ..

دڵ و گیان و ، هۆش و بیر و ،

ئاکار و ئارەزوویان پەکخستووە و

بوونەتە هۆکاری ڕەخنەکانتان لێی .

شێوەو ڕووخسار

بەهای مرۆڤ بەرز و نزم ناكەن،

مرۆڤ بە ناخ و، هۆش و بیر و، ڕەفتار و، كەسایەتی،

بەرز یان نزم دەبێتەوە ...

كە ئەوەش :

هەم هەوڵ و هیممەت و دەست و دڵی خۆی تێدایە،

هەم ئارەزوومەندانە هەڵیاندەبژێرێت.

مرۆڤ بۆ سۆز و بەزەیی،

بەدایکی یەتیم دەکەوێ و ...

بۆ پێویستییەکانی ژیانیش،

بە باوکی.

ئەوەی چرای:

مەعریفەت و، مەعنەوییەت و، حەقیقەتی،

کەوتۆتە دەست و دڵ..

نە هەر خۆی ون نابێت و ڕێگا ون ناکات،

بەڵکو ڕۆشنکەرەوەی ڕێگایە تاخەڵکانی تریش

ون نەبن.

لە كۆمەڵگایەكی نەخۆشا ..

ساغبوون و، سەلامەت مانەوە، ئاسان نییە ...

چ جای چارەسەركردنی خەڵك!

بۆیە دەبێ لەیەك كاتدا:

هەم خۆپارێز، هەم پارێزەر، هەم حەكیم و

چارەساز بین.

قسە كردنی بێ مۆڵەت خواستن
وەك چوونە ماڵی
بێ لە دەرگادان وایە.

مرۆڤی دڵبچووک لە صولحکردنیا،

تەواوی کێشە و هۆکار و تۆمەتەکان، دووبارە

دەخاتەوە بەرباس و لێکۆڵینەوەو ..

هەمدیسان دڵەکان بریندار دەکاتەوە ...

وەلێ مرۆڤی دڵمەزن لە ئاشتەوایی کردنیا،

تەنها یەک ڕستە دەدرکێنێ و ... دەڵێ:

چیبکەین بۆ ئەوەی جارێکی تر کێشەکان

سەرهەڵنەدەنەوە و

بەهۆیەوە برینەکان قووڵتر نەبنەوە ؟!

بەتوانجێکەوە بەهاوسەرەکەی گوت:

جوان بە ڕێگادا برۆ، با ملت نەشکێ!

هاوسەرەکەی هەر وەک خۆی بە ڕێدا رۆیشت ...

ملی نەشکا،

دڵی شکا!

ئاساییە بڕێ لە مرۆڤەکانی ئەم سەردەمە
لەچەشنی گورگ ببینی،
گرنگ ئەوەیە تۆ، لەبەرامبەریاندا
وەکو مەڕ ڕەفتار نەکەیت،

من دەربارەی مرۆڤ دەدوێم،

یانێ ستایشی مرۆڤ دەکەم و ئەوە لەناخما بالآیە ،

مرۆڤ خۆی ..

مەخلووقە شکۆمەندەکە،

بەر لەوەی ببێتە:

مرۆڤێکی باش یان خراپ.

لە هەرکوێ تۆ هەبێت،

ئەوێ:

ئاوەدانییە ... ژیانە ...

من هەمیشە پەنجەرەی خولق و شەوقم،

بەرووی ماڵی تۆ کراوەیە ...

ئەی مرۆڤ.

تەنانەت هەژارترین مرۆڤی دونیاش،

دەتوانێت بە دوو بەخشش و سەرمایە بەخشندە بێت

کە قەت نابڕێنەوە و کۆتاییان نایە ..

ئەوانیش:

( قسەی باش و ... زەردەخەنە ) ن .

بۆ ئاشتەواییەك:

ئەگەر زەویت بەجێهێڵا و چووی بۆ هەسارەیەکی تر،

ماندوو مەبە ...

لەبەر شەڕ و ئاژاوەو ناتەباییەکیش:

ئەگەر دەرگای ژیانت بۆ هەتایە لەسەرخۆت داخست،

قەینا.

چی بدۆزمەوە،

بەدوای خاوەنی دەگەڕێم ...

ساڵێ بانگەوازی بۆ دەکەم..

بەتەنها:

ئیمان و، ئاکار و، ئەوین و، ئازادی و، ئیرادە، نەبێت!

بێ دوودڵیی دەیانخەمە باخەڵی ناخم ..

چون بە هی خۆمیان دەزانم.

ئەگەر حەزدەکەی

خۆشەویستی دڵەکان و ماڵەکان بیت ..

تیر و توانج و، گلە و گازاندە و، عەیبلێگرتنەکانت

کەمکەوە.

تۆ بەتەنها یەکجار دەژیت،

ئەو یەکجارەش چۆنت دەوێت وەها بژی،

یانیٚ:

ناخ و کردەوەت هەماهەنگ بەیەکتر بکە و،

باوەڕت چۆنە وەها زیندەگیی بکە.

بەلەمێکی بچووک،
دەتوانێ لەدەریایەکی گەورەدا
بتپەڕێنێتەوە.

ستەمکاریش وەک هەر کەسێکی تر،
دەخوات و دەخواتەوە و دەخەوێت و
نەخۆش دەکەوێت و زوو یان درەنگ دەمرێت و،
دواجار لەخاک و خۆڵدا
گۆشت و پێست و ئێسقانیشی وردوخاش دەبێت.

لەخۆتاندا .. بۆ سازكردنی زەمینەی:

دڵێكی میهرەبان، ڕەوشتێكی باڵا،

گوفتارێكی شیرین، ڕەفتارێكی جوان و باش،

چاوەڕوانی هێچ موفاجەئەیەكی ئارامیبەخش مەبن

لەژیانتانا.

لقە دارێک دەتوانێ بەرگری لەخۆی بکات و

نوقمی ژێر ئاو نەبێت،

تۆش:

تەنانەت ئەوەندەی لقە دارێک بەرگری لەبوون و

حەقیقەت و کەسایەتی خۆت بکە و

مەهێڵە ناتەندروستانە

نوقمی دەریای بەرژەوەندی و ئارەزووەکانت ببیت.

ئەوەی بۆ مرۆڤ:

مایەی خەوێکی تەندروستە،

ژوور و کۆشکێکی شاهانە و

جەستەیەکی سەلامەت نییە ...

بەڵکو دڵێکی ئارام و، ویژدانێکی ئاسوودەیە.

مرۆڤی ئازاد:

لەو شوێن و كاتەوە بەدیار دەكەوێت،

كە بەرگریكردن لەئازادیی دەیخاتە مەترسی

لەدەستچوونی ماف و بەرژەوەندییەكانی و

تەنانەت مەترسی لەدەستدانی ژیان و گیانیشییەوە.

ڕێت لەناخت پێدەگیرێ

بۆ نەهاتنە ژوورەوەی ڕق و کینە،

وەلێ ئەوەت بۆ مەحەببەت پێ ناکرێ .

هیچ میوانێك ناتوانێ

بێ وەرگرتنی مۆڵەت و پرس و ڕا بێتە ماڵەكەتەوە،

ئیتر بۆچی گلەیی لەو ڕەوشتە ناپەسەندانە دەكەیت ..

كە ئارەزوومەندانە لەماڵی دڵتا جێنشینت كردوون و

بەهۆیەوە:

سەرتاپا پشێوی كەوتوّتە هەواری بوونتەوە ؟!

ئەو بەربەستانەی چەشنی دیوار دێنە پێشیٚ،

بەسەریاندا ئاوا مەبە،

چون ئەودەمە تەنها خۆت ڕزگارت دەبێت ...

بەڵکو دەرگایەکی لیٚ دروست کە،

تا هەرکەس لەدوای تۆوە هات

بەسانایی بچێتە ئەودیویەوە.

وەختێ مەحەببەت:

چەشنی ڕووبارێکی سۆزمەند،

بەشادەمارەکانی وجوودی مرۆڤا گوزەر دەکات ....

دڵ و دیدە و

سەراپای بوونی

لێوانلێو لە ڕۆشنایی و میهرەبانی دەکات.

مرۆڤ:

ستەملێکراوترین مەخلووقە،

وەرن با دەستەملانێ بین و

ئاشتبکەینەوە.

ناشیرینی درۆزن لەوێوە نییە:
کە بەهۆی ناڕاستییەکەوە
بەرژەوەندییەک بەردەست دەخات،
یان مەترسییەک لەخۆی دووردەخاتەوە،
بەڵکو: لە جورئەتی ئەو خیانەتەوەیە
کە لەگەڵ متمانەی بەرامبەردا دەیکات.

دەروون تا ئازار نەچێژێت

گەورە نابێت .. بەهێز نابێت .. خۆڕاگر نابێت ..

ئازاریش ناچێژێت تا لەناو مرۆڤەکان نەژییێت ...

کەواتە یەکەم مەرجی گەورەبوون و بەهێزبوون و

خۆڕاگربوونی دەروون،

کۆمەڵایەتی بوونی مرۆڤە.

بێ لێبوردن، لە ئازاردانی یەکتر ...

بێ چاوپۆشین، لەهەڵە و کەموکوڕیی یەکتر..

هەرگیز ناتوانین

بەردەوامی بەدۆستایەتیمان بدەین.

لەم سەردەمەدا ،

ئافرەت بتوانێ:

گلەیی و باسی پاشەملە لەخۆی دارنێت،

پیاویش بتوانێ:

بەخۆهەڵدان و توورەیی لەناخیا ڕیشەکێش بکات.

وەک ئەوە وایە شۆڕشێکی گەورەو کاریگەریان

بەسەر دەروون و زیندەگیی خۆیاندا بەرپاکردبێت.

هیچ لێپرسینەوەیەکمان سەبارەت بەو قسمەتانە لەگەڵ

ناکرێت، کەدەست و دڵ و هەڵبژاردنی خۆمانی تێدا

نەبووە لە وەهابوونێکمان،

چەشنی:

( ڕەنگمان.. زمانمان.. قەد و باڵا و شێوە و ڕووخسارمان..

گەل و نەتەوەمان.. خاکمان.. هتد )

ئەوەی بایەخدارە بۆ مرۆڤ و لێپرسینەوەی ئاسمان و

زەوی لەسەرە:

( ئاین و پەیام و بیر و بەرنامە و ڕەوشت و کردەوە و

کەسایەتی ) مرۆڤە.

دلێرترین مرۆڤ

ئەو مرۆڤەیە:

وەها دەژییت کە باوەڕی پێی هەیە،

واتە هەم ناخ و، هەم بیر و هۆش و، هەم کردەوەی،

هەماهەنگی یەکتر کردوون.

دان بنێ بە چۆنییەتیت،

وەلێ ڕازیی بەمانەوە مەبە لەو چۆنییەتیەتدا ...

تاییەت ئەگەر نابەدڵ بوو.

ئەوەی بتوانێ بەرەو ڕوو ستایشت بکات،

ئاسان دەتوانێ

لەپاشەملەش سەرزەنشتت بکات.

مەعشووق:

بۆ داگیر کردنی دڵی عاشق،

پێویستی بەناردنی سووپا و شیر و تیر و

ئەسپسواران نییە،

ئەو هەر تەنها ئاماژەیەک بکات ... بەسە ..

بۆوەی عەرش و قورشی بکەوێتە مشت.

مەرج نییە ئەو کەسەی لەتۆ بەتەمەنتر بێت،

لەتۆ هۆشمەندتر و زیرەکتر بێت،

بەڵام بەدڵنیاییەوە ئەو کەسەی بەساڵ گەورەترە،

لەتۆ بەئەزموونترە بۆ ژیان ..

کەواتە پیران، گەر سوود لەهۆش و بیریشیان

وەرنەگیردرێت،

ئەوا: ئەزموونیان سوودمەند و بایەخدارە.

لەباران فێری ڕەوشتێکی سەیر بووم ،

بە ئێوەشی دەڵێم:

ئەو هەر کات مشتە گەورەکانی بۆ بەخشندەیی واڵا

دەکرد،

لەهیچ کام لەموشتەرییەکانی نەدەپرسی

تۆ کێی! خەڵکی کوێی!

خاوەن چ ئاین و بیر و بەرنامەیەکی!

موریدیی:

یانیٚ وەک ئوستاد بوون،

نا وەک ئوستاد نواندن.

بچووکترین دیاری کەسێکی خۆشەویست،
نەک هەر وەک جوانترین و نایابترین خەڵات دێتە
هەژمار ..
بەڵکو شوێن و کاتی دیاری بەخشینەکەش
دەبنە وێستگەیەکی درەخشان
لەیادەوەرییە زیندوو و کاریگەرەکانی مێژووی ژیان.

نییم لەگەڵیا:

شەڕ لە بەتاڵیی باشتر بێت.

ئازادی:

دەبێ بدرێت، نەسەنرێت ...

لانی کەم،

دەبێ ئێمە:

بیدەین، نەک لێمانی بسێنن.

وەختێ ڕق و کینەی بەرامبەر لەناخی خۆتا بنبڕ و بەکۆتا دەهێنیت،

قازانجەکەی هەر بۆ دەروونی خۆت نییە کە پڕدەبێت لەئاسوودەیی ...

بەڵکو دڵ و گیانی بەرامبەرەکەشت خاڵیی دەکەیتەوە لەخەیاڵات و داگیربوونی ناتەندروست و سەرقاڵبوونی خەفەتئامێز،

دەتوانی لە ئێستاوە ئەم پەیامە تاقیبکەیتەوە.

گوێ بەقسەی ئەوانە مەدە کە ڕێگیری لەهەنگاوەکانت

دەکەن و، دەڵێن:

هەرگیز بەڕێگایەکدا مەڕۆ کە بەر لەتۆ کەسی پێدا

نەڕۆیشتووە ...

بە پێچەوانەوە، تۆ پێشەنگ و یەکەم کەس بە

کەپێیدا بڕۆیت ..

ئەگەر سەرکەوتی، ئەوا دەبیتە داهێنەر و قارەمان،

وەگەر نا: دەبیتە قوربانیی بۆ ڕزگاریی ئەوانی تر ..

کە ئەوەش خەسڵەت و وەزیفەی مرۆڤە مەزنەکانە.

هەمیشە دژی شەڕ بە ..

نا لەبەر ئەوەی بترسیت و خۆت دوورەپەرێز بگریت،

بەڵکو لەبەر ئەوەی لەشەڕدا

زیانمەندترین مەخلووق مرۆڤە و، ئەوەی تیاشیدا

دەبێتە قوربانی ... هەر مرۆڤە،

کەچی بەناوی مرۆڤ و،

بەرخاتری پارێزگاری لەماف و ژیان و ئازادییەکانی

مرۆڤیش دەکرێت.

تەواوی بوونەوەران

ئەوە دەکەن کە بۆیان دیاریکراوە،

تەنها مرۆڤە .. ئەو تاقانە مەخلووقەی

چی و چۆنی بویێت، ئەوە دەکات ...

چ بەخششێکی گرانبەهایە ئەمە!

بەم چەشنە ئامۆژگاری مناڵەکانتان بکەن و

پێیان بڵێن:

ئەگەر ستەم بکەن، جارێك سزاتان دەدەین ...

وەلێ گەر ستەم قبووڵکەن، دووجار سزاتان دەدەین..

چون ئەوەی ستەم قبووڵکات، بێگومان ستەمیش

دەکات..

بەر لەهەر کەسیش لەخۆی.

لە ژیان سەنگینتر بۆ مرۆڤ، ئازادییە..

کەواتە مرۆڤ:

لەهەموو چرکەساتێکیا

پێویستی بە قوربانیدانە ..

لەپێناو نەمر هێشتنەوەی بیر و باوەڕی.

لەئێستادا ..

ئەوانەی زیهن دەدوێنن چەند زۆرن و،

ئەوانەش کە:

گفتوگۆی دڵ و گیان دەکەن ...

چەندە کەمن!

گۆڕینی

دەموچاو و کەسەکان گرنگتر نییە،

لەگۆڕینی دڵەکان.

هەموو گوفتار و ڕەفتار و هەڵوێست و

هەڵسوکەوتێکی مرۆڤ،

لە کانیاوی بیر و هۆش و ... دڵ و گیانییەوە

هەڵدەقوڵێت.

خائینترین مرۆڤ،

ئەو مرۆڤەیە کە خیانەت لەخۆی دەکات ...

بەوەی، بەردەوام تاوان و هەڵەی ناشایستەی

وەها دەکات،

کە هەم دەروونی، هەم جەستەی تووشی سزا دەکات و

هەم کەسایەتیشی دووچاری داڕووخان دەکات.

هەرگیز لەو دوژمنە ناترسم کەشمشێری لەکالان

دەرکێشاوە،

چون ئەو: ڕووبەڕووی جەستەم دەبێتەوە و

دوا دەستکەوتی ئەگەر وەچەنگی بکەوێت،

کوشتنی منە بەتەنها ...

وەلێ ئەو دوژمنەی ڕووبەڕووی بیر و هۆش و دڵ و گیانم

دەبێتەوە، پشووم نامێنێت، لەترسیی ..

چون ئەو گەر منی داگیر کرد، لەگەڵ منا

ڕەنگە دەیان سەربازی تر،

دەستی: فیکر و ئیمان و ئیرادەیان بەرزکەن و،

تەسلیم بین.

لە ئێستادا،

ئەم کۆمەڵگایەی ئێمە،

لەڕووی گەشەی پەیام و، بیر و باوەڕ و ..

پەروەردەی دڵ و گیان و، ئاکار و ڕەوشتەوە ...

بێ خەمخۆر و بێ خاوەنە.

ژمارەیان کەمە ئەوانەی:

بە پلە و پایە ..... بە دەسەڵات ....

بە ناوبانگ و شۆرەت ... بە پارە و پووڵ و سامان..

نەگۆڕێن.

لە دەوڵەتی دەروونی مرۆڤا،

هیچ شێوە ژیانێک میسالیی نییە ...

دەی کەوایە چۆنتان دەوێت،

وەها چەشنە ژینێک لەدونیای دڵی خۆتانا،

نەخشە بکێشن.

بیر و بۆچوون ..

بەهاوار و هەڕەشە ... نا

بە بەڵگە،

یان

ڕەنگدانەوەی لە ڕەفتار و ڕەوشتا،

دەسەلمێنرێت.

گفتوگۆ:

هونەرێکی باڵایە و،

شێوازی تایبەت بەخۆی هەیە بۆگەیاندنی پەیامەکان و،

گۆڕینەوەی ڕاز و نیازەکان ...

سەرکەوتووترینیان:

هێمنانە دووان و بەدڵ گوێگرتنە لەبیرو ڕای بەرامبەر ..

شکستخواردووترینشیان:

هاوارکردن و، بچووکڕوانینی بۆچوونی کەسەکانە.

برۆ بەسەلامەت ..

دەڕۆم بە خێر ..

وەهایە لێکدابڕانی ئازیزان.

شەڕ هات و، بەدەستە گەورەکانی هەموومانی
پاڵنایەوە ماڵی خۆمان ..
شەڕهات و، لەجیاتی شەکر خوێی خستە نێو چای
پەیوەندییەکانی نێوان من و خێزانمەوە ..
هات و گوڵەکانی خۆشەویستیی پلیشاندەوە،
پەڕ و باڵی باڵندەکانی دۆستایەتی هەڵکەناند ..
شەڕ ... شەڕ ... شەڕ
هات و لەسەر دیواری تەمەن و ژیانمانی نووسی:
کەس بۆی نییە بیربکاتەوە ... کەس بۆی نییە بژی .

مەزنیی تۆ ئەوکاتە بەدیاردەکەوێت ..
کە بتوانی لەناخی دڵتەوە
پیرۆزبایی لە ڕکابەرە براوەکەت بکەیت.

وتە:

لەکانیاوی بیر و هۆشەوە هەڵدەقوڵێ ...

بیر و هۆشیش:

هێزی خۆی لە دڵ و گیانەوە وەردەگرێت..

هەم وتە، هەم بیر و هۆش، هەم دڵ و گیانیش،

میوەی درەختی ڕەوشتن.

حەکیم نییە، ئەو وتاربێژەی

قسە بۆ کەسانێک دەکات،

کە ئەوان هێشتا

گومانیان لە ڕەوشت و کەسایەتی ئەو هەیە.

هەرکەس لە:

چییەتی بیر و

چۆنییەتی ڕەفتاری ئازادە ..

کەواتە هەرکەس

لە خەم و شادییەکانی خۆی بەرپرسیارە.

خۆزیا وەک چۆن هەمووان

توانای قسە کردنیان هەیە و،

بەهۆیەوە: یەکتر لە ڕاز و نیازەکانیان ئاگادار دەکەن ...

ئاوهاش هەمووان

ئارەزووی بیرکردنەوەیان هەبوایە و،

بەهۆیەوە:

دڵی خۆیان ئاسوودە و، ژینی یەکتریان ڕازاوە و

هێمن و سازگار کردبا.

ڕاستی:

ئازاری زۆرە،

بەڵام هەم نەمر، هەم سەركەوتنی مسۆگەرە..

ناڕاستی:

ئەگەرچی چێژ و بەرهەمی بێ سنوورە،

وەلێ هەم تەمەنی كورت، هەم شكستی بێ گومانە.

هیچ کات:

بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کێشە ...

بۆ هاوڕێبوونی حەقیقەت ...

بۆ سازگاربوونەوەی دەروون ...

بۆ ڕێکخستنەوەی پەیوەندییەکان ...

درەنگ نییە.

وەک برسییەکی شەکەت ... بەدوای پارووییٚ ناندا ..

وەک تینوویٚکی وشک و ماندوو ... بەدوای قومیٚ ئاودا ..

وەک هەژاریٚکی بیٚ دەرەتان ... بەدوای بستیٚ خاک و

ماڵدا ..

شەکەت و وشک و بیٚ دەرەتان:

بەدوای ئیمان و ئازادی و ئەوین و ئیرادەدا، ویٚڵ بە.

هەژاری و ... خەم و ... کێشە،

سێ کابووسن:

قوفڵ لەدەرگای

خولق و ... شەوق و ... شادی مرۆڤ دەدەن.

لە ڕووکەشدا ..

خەفەت قەبارە و سەنگێکی نییە،

بەڵام کە یەخانگیری دەروونی مرۆڤ دەبێت:

یەکجار قورس و گرانی دەکات،

بەچەشنێک ..

تەنانەت دەست و قاچەکانیشی لەکار دەخات.

کەمتر لەپێویست ڕوودانە کەسێک،
مەغدووری دەکات و
ئەمەش وادەکات دەروونی بارگاوی بێت بەڕق و کینەو
لەهەر دەرفەتێک چەشنی فیشەک بەڕووتا بتەقێتەوە ..
بەهەمان شێوە ... زیاتر لەپێویست ڕوودانە کەسێک،
مەغرووری دەکات و
ئەمەش وادەکات دەروونی لێوڕێژ بێت لەوەهمی
فەخر و شانازی و خۆبەشت زانین و
لەهەر هەلێک گوێچکە و ناخت پڕ بکات لەجەورو جەفا.

نە خەون: خۆزگەکانت بۆ دەستەبەر دەکات ..

نە واقیع: لەخەمت دوور دەخاتەوە ..

ئەوەی مایەی ڕزگارییتە

هیممەتی تۆیە لەئاگاییدا.

وەک چۆن لەپێناو ئازادیدا

هەرچیت بەسەر هات بەکەمی بزانە ..

لەبەرامبەردا.. ئاوهاش بۆ ململانێ و تۆڵە،

بچووکترین هەنگاو و هەڵوێست

بەزۆر و زیادەڕەویی بزانە.

کەمن، کەمن، بێ ئەندازە کەمن

ئەوانەی:

بێ بەرژەوەندی ئابووری و غەریزی و پلەوپایەیان ..

بێ ڕەچاوی کەسایەتی و بنەماڵەیان،

خزمەت بەمرۆڤ و کۆمەڵگای خۆیان بکەن.

مەگەر ئیمان و ... ئازادیی ..
دەنا شتێكی تر بەقەد بێدەنگیی
كەسایەتی مرۆڤ پتەو ناكات و،
ناخی نادرەوشێنێتەوە.

هەرچی چەشنە
بوونەوەر و ئاژەڵ و باڵندە هەیە،
بەقازانجی نەسل و نەوە و جۆر و ڕەگەزی خۆیان
لەهەوڵ و تێکۆشان دانە ..
تەنها مرۆڤ نەبێت ... کە تاکانە مەخلووقێکە
دژ بەرەگەزو چەشن و نەسل و نەوەی خۆی
لەجەنگ و کوشتاری خوێناوی دایە.

مرۆڤ شایستەی ئەوەیە قوربانی بۆ بدرێت ..

لەسەرrووی هەموو قوربانیدانێكیشەوە،

ڕزگاركردنیەتی لەكۆیلەیی:

هۆش و بیر و، دڵ و گیان و،

ئارەزووە نادروستەكان و ، خووە ناپەسەندەكانی.

لە چەند ساتێکی ژیانتا

هەڵەیەکی وەها مەکە،

هەموو تەمەن بەهۆیەوە بناڵێنیت.

تەنانەت

لەگەڵ مرۆڤە دڕندەو زیانبەخشەکانیش

میهرەبان و چاکەکار بە ..

بەمە:

یان دڵ و گیانیان بەرەو سازگاریی دەگۆڕێت،

یان لە یادەوەرییاندا بۆ هەتایە بە نەمریی

دەمێنیتەوە.

سەرمایەی مرۆڤ ... ئەمەنییەتی ..

سەرمایەی ئەمەنی ... ڕەوشتییەتی ،

سەرمایەی ڕەوشتی ... چاکەکانییەتی ..

سەرمایەی چاکەکانی ... دڵییەتی ..

سەرمایەی دڵی ... سازگاربوونییەتی ..

سەرمایەی سازگاربوونی دڵ ...

ئەوین و خۆشەویستییەتی بۆ مرۆڤ و

بۆ تەواوی بوونەوەران.

ئاسان نییە چاکە کردن لەگەڵ کەسانێک،

کە دڵنیایت لە ئایندەدا

نە هەرچاکەت لەگەڵ ناکەنەوە،

بەڵکو خراپەشت دەرحەق دەکەن ...

بەڵام تۆ هەر بیکە.

مرۆڤی بچووک:

حەز بە لۆمە و سەرکۆنە کردنی ناکات ..

کەچی مرۆڤی مەزن:

بە پیاهەڵدان و ستایشکردنی بێ تاقەت دەبێت.

لە ئێستاتدا ..

ئامادەیت لەگەڵ تەواوی نهێنییەکانی ژیانت

ڕووبەڕوو بکرێیتەوە ؟

هیچ كات،

بەرهەم و دەرەنجامی كارەكانت ... مەكەرە پێوەر

بۆ سەركەوتن و

ڕاست و دروستیی پەیامەكانت.

ئەگەر ناچار بەهەڵبژاردنی یەکێکی ئەوانە کرایت ..

تۆ:

دڵشکاو بە، نەک دڵشکێن ...

مافخوراو بە، نەوەک مافخۆر ...

لێبوردە بە، نەک تۆڵەستێن ...

بێدەنگ بە، نەوەک قسەکەر ...

ڕۆیشتوو بە، نەک ڕاوەستاو ...

ئازاد بە بەمەرگەوە، نەک کۆیلە بیت بە ژینەوە.

هەمیشە لەتەواوی ئەو گرفتانەی کە دێنە ڕێگات،
ڕەچاوی ئەم دوو خاڵە بکە:
١- پارێزگاری لەڕەوشتی خۆت و، لانەدان لەو بەرنامە و
پەیامانەی کە باوەڕت پێیان هەیە ..
٢- هەروەها لەبیربوونی ئەو بەرپرسیارێتییەی کە هەتە،
بۆ گۆڕینی دڵ و دەروون و هۆش و بیر و ڕەوشت و
کردەوەی ئەو کەسانەی دروستکاری کێشە و گرفتەکانن
بۆ تۆ و، زۆرێک لەتاکەکانی کۆمەڵگا.

کێشەی مرۆڤی ئەم سەردەمە ئەوەیە،

وەختێ دەرد و نەخۆشییەکی هەبێت لەشوێنێکی،

دەست بۆ شوێنێکی تر دەبات بۆ چارەسەر ...

بۆ نموونە: ژانی سەری بە حەب و کەپسوول عیلاج

دەکات ..

بێ ئاگا لەوەی:

ژانی سەر، دەردێکی ماددی یان مەعنەوی شوێنێکی ترە

کە ئازارەکەی لە ( سەر )دا خۆی نمایش دەکات.

گۆڕانکاری

لەسەر شەقامەکان ناکرێت ..

بەڵکو لەنێو

هۆش و بیر و

لەنێو دڵەکاندا دەکرێت.

هاوسەری بچووک:

نهێنی خانەوادەکەی

بەراست و چەپ، لای یار و نەیار پەرش دەکات ..

وەلێ هاوسەری مەزن:

کەموکوڕیی خێزانەکەی

لای خزم و خۆیش و، کەسوکار و،

تەنانەت لای دایك و باوك و خوشك و براکانیشی

باس ناکات.

باوەڕ بێنە بەوەی
کە ژیان بێ کێشە و گرفت و چەرمەسەری نییە و ،
نابێت . .
بەڵام هەرگیز
پێیان ڕازی مەبە و،
تەسلیمیشیان مەبە.

هەر کێشەیەک کە دێتە ڕێت،

زووتر قەبارەی کێشەکە و کاریگەرییەکەی

لەسەر دڵ و دەروون و لەژیان و لەواقیعتدا،

دیاریی بکە ...

بزانە کە بەخەم هیچ پێکنایەت و چ گۆڕانکارییەکی

خێرمەندانەش لەبابەتەکە ڕوونادات،

بۆیە هەرچی زووە پلان دارێژە بۆ چۆنییەتی

ڕووبەڕووبوونەوەی و

هەنگاو هەڵگرە بۆ بنبڕ کردنی.

ئەگەرچی خەم لە ڕووکەشدا

سەنگ و قەبارەیەکی نییە ..

بەڵام لەواقیعدا

هەم لاشە،

هەم دڵ،

قورس و داتەپیو دەکات.

مرۆڤی بچووك:

كەم بیر دەكاتەوە و زۆر قسە دەكات ...

مرۆڤی مەزن:

زۆر بیر دەكاتەوە و ،

ناچار نەبێت هەر قسە ناكات.

مرۆڤی بچووك:

بۆ دەستخستنەوەی مافە بچووکەکانی

ئامادەی تەنانەت پچڕاندنی تەواوی

پەیوەندییەکانیشیتی ..

کەچی مرۆڤی مەزن:

بۆ نەپچڕانی پەیوەندییەکانی

ئامادەی بەخشین و،

تەنانەت دەست و دڵ هەڵگرتن لەتەواوی

مافەکانیشیتی.

ئەوەی ڕەواج بە کەلوپەلەکانتان دەدات و

کاڵاکانتان بۆ دەفرۆشێت ... زمانتانە ..

کەواتە لەبیرتان بێت

چی دەڵێن و

چۆن پێناسەی شتەکانتان دەکەن.

پیریی:

بەتەنها سپی بوونی قژ و تاڵە مووەکانی جەستە نییە ..

بەتەنها چورچ و لۆچ تێکەوتنی پێست و ڕووخسار نییە..

پیریی نەمانی ئومێدە لە ژیاندا ...

بەرخورد نەکردنی شکۆمەندانەیە لەگەڵ سروشت و

تەواوی بوونەوەر..

نەڕوانینی مرۆڤە بەچاوی ڕێز و ڕەوشت.

ئەگەر چوویتە شاری کوێران ..

دەست بەچاوتەوە نا

دەست بە ویژدانتەوە بگرە.

هەر كارێكت كرد

بەوپەڕی دڵسۆزی و گرتنەبەری ڕێ و شوێن و

وردبینییەوە بیكە و ..

ئیتر خەیاڵت لای ئەوە نەبێت

ئاكامەكەی چی و چۆن دەبێت.

ئەوەی خۆشەویستیی پێی دەکرێت ..

نە ترس ...

نە بەخشیش ..

هیچ کامێکیان پێیان ناکرێت.

پەیامداران:

بەوە نا کە خزمەتی بێ ئەندازە بە خەڵکی دەکەن ..

بەڵکو بەوە کە لەسەر ئەو خزمەتانە

هیچ شتێکی ماددی و مەعنەوییان لەنیاز نییەو نایانەوێ،

گەورەن لە دڵی خەڵکیدا.

یەكێك لەو ڕێگر و فێڵانەی كە دەروون و خەڵك لێتی دەكەن بۆ لێبوردنی هەمووجاری بەرامبەرەكانت ..

ئەوەیە كە پێت دەڵێن:

( لەهەڵەی بەرامبەرەكەت مەبووره تا فێر نەبێت و ڕانەیەت لەسەر هەڵەی تر )..

تۆ گوێ بەم هاوكێشەیە مەدە و، لەبەر گریمانەیەك كە هێشتا نازانی بەهۆی ئەو لێبوردنەتەوە بەرامبەرەكە تەركی هەڵە دەكات یان بەردەوام دەبێت لەسەری، سروشتی خۆت مەگۆڕە و لەسەر لێبوردنی بەرامبەرەكانت بەردەوام بە.

بێ فیداکاریی

ژیان و کۆمەڵگە بەرەو باشتر و جوانتر ناڕوات ...

لەپێشترینی فیداکارییەکانیش

جوانترکردنی دڵ و، ڕەوشت و

باشترکردنی بیر و، کردەوەکانی خۆمانە.

ترس:

ئەو دەردە کوشندەیە

کە ناهێڵێ بگەیتە بەخششە درەخشانەکانی چەشنی:

ئازادیی و حەقیقەت و مافەکانی تری مرۆڤ.

ئەو کەسەی ستەمت لێدەکات ..

بەدڵنیاییەوە بزانە کە بەر لەتۆ خەریکە ستەم

لەخۆی دەکات،

هەم دڵی نائارام.. هەم کەسایەتی ناشیرین..

هەم مرۆڤبوونی خۆی لەکەدار دەکات ..

بۆیە هەرچی زووە لەخەمی ڕزگاری و

لەهەوڵی ڕێگیریی دا بە ...

هەوڵی ڕێگیری لەستەمی ئەو نسبەت بەخۆی ..

بەر لەخۆت، خەمی ڕزگاریی: ا دڵ و کەسایەتی و

مرۆڤبوون ای ئەو ..

ئەوە بێت با .. نەریتی تۆ.

ئەگەر چاکەکاریی گرانە ..

خۆ چاکەخوازیی ئاسانە!

هیچی تێناچێ و

لە دەرووونتانا درێغی بۆ مەکەن.

ڕازیبوون بەستەم، یا بێدەنگیی لەبەرامبەریدا،

ئەو دیوارە بڵند و ئەستوورەیە

کە ناهێڵێ خۆری جوامێری و نەبەردیی ...

لە باخی مرۆڤبوونمان بدات و ..

گوڵی ئازادیمان بپشکوێ.

خۆپەسەندیی:

ئەو بەربەستە پۆڵاینەیە ..

کە ناهێڵێ ( ژیریی )

میوانی ڕەزا سووکی مرۆڤبوونمان بێت.

هەندێک نهێنی خۆیان بەناو خەڵکیدا بڵاوە پێدەکەن و

ئەو وردە شووشانەش نابینن

کە لە شکانی کەسایەتیاندا بەر لەهەرکەس دەکەونە

ژێر قاچی خۆیان ..

هەندێکی تر بەخۆشحاڵییەوە بەدوای نهێنی خەڵکیدا

دەگەڕێن و

لەو پێناوەشدا بەخشینی هەموو شتێ بەکەم دەزانن ..

تۆ لەوانەبە کە بڵاوکردنەوەی نهێنی خۆیان

هێڵی سوورە و

هی خەڵکییش هەر بابەت نییە بەلایانەوە.

سوێند ... نا ..

قسە و باس و پێناسە و ڕوونکردنەوەش ... نا ..

بەڵکو:

ڕەوشتت لە ڕابردوودا و

کردەوەشت لە ئێستادا

باشترین هۆکارن بۆ دروست بوونی متمانە

لە دڵی خەڵکیدا.

مرۆڤی مەزن:

لەهەر چەشنە پچڕانی پەیوەندییەکا، ئەگەر

تەواوی حەق بەلای خۆشیدا بێت

دواجار هەر ئۆباڵەکەی دەخاتە ئەستۆی خۆی و

ڕەخنەی توند ئاراستەی خۆی و چۆنییەتی بەرخورد و

هەڵوێست و هەڵسوکەوتی دەکات ..

وەلێ مرۆڤی بچووک: هەمیشە بە تەرازووی

بەرژەوەندی، پەیوەندییەکان کێشانە دەکات و

تەواوی شانازییەکان بەلای تای تەرازووی خۆیدا و،

تەواوی شکست و بارگرژی و تێکچوونی

پەیوەندییەکانیشی، دەخاتە تا لارەکەی ئەویترەوە.

مرۆڤی پەیامدار و مەبدەئی

باکی بەتاقیکردنەوە نییە،

چون ئەو بەرخاتری کەس و

لەبەر هیچ ترس یان بەرژەوەندییەک

لەو پەیامانە لانادات کە باوەڕی پێیان هێناوە.

زۆر بلێیی و درێژدادڕیی:

حیکمەتەکانی دانا نابەردڵ دەکات و ..

مرۆڤی جوان و باشیش ناشیرین دەکات ،

کەمدووییش:

کاڵفامییەکانی نادان و نەزان دەشارێتەوەو

مرۆڤی ناشیرین و خراپیش

جوان و بەردڵ و سەنگین دەکات.

هەندێک ترسنۆکن بۆ زاڵبوون بەسەر
ناخ و ناوەوەی خۆیان و
ئازان بۆ زاڵبوون بەسەر دەرەوەی خۆیاندا ..
هەندێکی تر ئازان بۆ ناخی خۆیان و،
ترسنۆکن بۆ سەرکەوتن بەسەر دەرەوەیاندا ..
هەندێکی تر ترسنۆکن لەناخەوە و،
ترسنۆکیشن لەدەرەوەیاندا ..
وەلیّ تۆ: ئازابە بۆ زاڵبوون بەسەر
ناخ و ناوەوەی خۆت و، ئازای حەکیمیش بە
بۆ زاڵبوون و سەرکەوتنت بەسەر
کێشە و گرفتەکانی دەرەوەتدا.

بۆ ئاراستەکردنی خەڵك و ڕێنماییکردنیان:

پێویست دەکات( تۆ )هەنگاویان بەرەو لا هەڵگریت و

بنەما گشتییەکان و، ئەرك و ماف و ڕێز و

ڕەوشتەکانیان بۆ بخەیتە بەر دیدە و دڵیان ...

وەلێ بۆ ئاراستە کردن و پەروەردەکردنی تاکەکان:

دەبێ دڵویستیی بۆ حەقیقەت و،

گەرموگەشیی بۆ حاڵیی بوون و،

جۆشوخرۆشیی بۆ گۆڕانی دڵ و گیان و ژیانیان،

ئەوانی هێنابێتە بەر دەرگای دڵی تۆ.

یەکێک لەجوانییەکانی

ئەو جەنگانەی لەدەروونداا دەکرێن ئەوەیە:

نە بکوژ خوێن لە شمشێری دەچۆڕێ و

نە کوژراو برینەکانی سوور دەچنەوە.

تەمەنی ڕاستەقینەی تۆ ..

بریتییە لەو

ڕۆژ و مانگ و ساڵانەی ...

کە بەوشیاریی و سەرنج و بایەخەوە ڕوانیوتە شتەکان و

بەرخوردی تەندروستانە و،

هەڵوێستی شایستانەت لەبەرامبەریاندا بووە.

هەندێک:

هەڵگری بەرنامەی باشن، بەڵام خۆیان لە واقیع و ڕەوشت و کردەوەیاندا خراپن.

هەندێکی تر هەڵگری بەرنامەی خراپن. بەڵام خۆیان لە واقیع و ڕەوشت و کردەوەیاندا باشن ..

هەندێکی تر هەڵگری بەرنامەی خراپن، ئیتر لەژیان و پەیوەندییەکانیشیانا هەر خراپن ..

تۆ لەوانەبە کە هەم هەڵگری بەرنامەیەکی باشن هەم لە واقیع و ڕەوشت و کردەوە و ژیان و تەواوی پەیوەندییەکانیشیانا لەلوتکەی بەرزیی و باشی دان.

چ لەو بۆچوونە ناهەموارترە هەیە

کە دەگوترێ:

مرۆڤ دیلی چارەنووسی خۆیەتی!؟

هەرچی گوفتار و ڕەفتار و هەڵوێست و هەڵسوکەوتە

بەتەواو ئازادی و ئیرادەی خۆمانەوە ئەنجامی دەدەین و

ئۆباڵەکەشی دەخەینە ئەستۆی چارەنووس!

چ بەدحاڵیبوون و چ خۆدزینەوەیەکە لەحەقیقەت،

ئەم بۆچوون و بیرکردنەوەیە!

بۆ نموونە: مەرج نییە وەک یەک
حەزمان بە هەنار بێت ..
یا هەردووکمان خۆشییمان لەڕەنگی پەمەیی بێت ..
ئەوەی گرنگە ئەوەیە:
باوەڕ بێنین کە هەناریش یەکێکی میوەکانە و،
لەباخ ناکرێتە دەرەوە ...
دان بنێین کە پەمەییش یەکێکی ڕەنگەکانە و،
بێ ئەو، لیستێک
بەناوی کۆی ڕەنگەکانی وجوود ... تەواو نییە..
ئەوەی وترا نموونە بوو، تەواوی جیاوازییەکانی تریش
هەربەم چەشنە پێوانە بکە.

هەوڵدە

یەکەمین کەسی تێکشکێنەری ئەم ڕستەیە بیت

کە دەڵێ:

( ئازادیی نادرێ، دەسەنرێ ) ..

تۆ هەمیشە ئازادیی بەخش بە بەئەوانی تر،

لە هەموو ژیان و پەیوەندییەکانتا.

ئاسانە

دڵی کەسێک داگیر بکەیت ..

وەلێ

ئەوەی گرانە ئەوەیە

کە بۆچی داگیری دەکەیت ؟!

بەرِۆژوو بوون: یانێ لەپاڵ بەخششە مەعنەوییەکان،
قەدر زانینی بەخششە ماددی و بنەڕەتییەکانی
مرۆڤ و ژیان ..
چەشنی خواردن و خواردنەوە و خانەوادە.
بەرِۆژوو بوون :
یانێ گەیشتنە ئاستێک لە دەروون
کە هەرکات پێویستکات
ئاسان بتوانی دەست و دڵبەرداری
تەنانەت پێداویستییە بنەڕەتییەکانی
مرۆڤ و ژیانیش بیت،
چەشنی خواردن و خواردنەوە و خێزانداریی کردن.

ئەگەر کەسێکت خۆشویست
با لەبەر خودی مرۆڤبوونەکەی بێت،
وەلێ گەر ڕقت لێی بووە ...
با تەنها لەبەر
ڕەوشت و هەڵوێست و گوفتار و ڕەفتارە
ناپەسەندەکانی بێت ،
کە شایستە بە مەقامی مەزنی مرۆڤبوونەکەی نین.

ئیرادە:

یانیٚ لە قووڵایی ناختەوە ، هەرکات پێویستکات

بە هەموو شەهامەت و نەترسانیێکەوە

بتوانی بڵێی ... نا.

ئیرادە:

یانیٚ بەگژداچوونی مەحاڵەکان.

ئیرادە: یانیٚ گەر پێویستی کرد،

توانای دەست و دڵ هەڵگرتنت هەبێت

لە خۆشەویسترینی شتانێکیش ..

کە ڕەگوریشاڵییان لە دڵ و گیان و هۆش و بیر و

هەست و نەست و، تەواو خانەکانی بوون و پێکهات و

حەقیقەتتدا چەقاندووە.

وەختێ مومارەسەی ئازادیت دەکەیت و

لەو پێناوەشدا ،

بەرگەی هەرچەشنە دەرد و ئازار و ڕەنج و

قوربانیدانێک دەگریت ..

ئەوە مانای، هەر خودی مومارەسە کردنی ئازادیت

نییە و بەس ...

بەڵکو بەمە، خەریکە بوونی خۆشت لە کۆمەڵگەی

مرۆڤایەتیدا دەسەلمێنی.

ئەگەر ڕێگای حەقیقیمان و وەزیفەی ڕاستەقینەمان

وەک خۆی بناسین ..

ئەوا هەرگیز ناپەرژێینە سەر ئەو شتانەی

چەشنی ڕێگر دێنە سەر ڕێگای

بەرەو حەقچوون و کەمالی مرۆڤبوونمان و

لایان لێ ناکەینەوە ...

چون ئەو دەمە بەدڵ دەزانین

ئەوانە شتانێکن دوامان دەخەن

لە گەیشتنە مەنزڵی سوکنابەخشی دڵ و گیان.

وەختێ نوێژ دەكەیت،

بەتایبەت لەكاتی كڕنووش بردنتا ...

بەزمانی حاڵ دەتەوێ بڵێی:

هەموو دەم لەبەرامبەر حەقیقەتدا ئامادەم

چۆك دادەدەم ..

ئەی بۆ

لەكاتی تر و لەشوێنی تر و بەرامبەر بەشتی تر و

لە ژیان و لە پەیوەندییەكانتا وەها نیت ؟

لە خۆشەویستیتا

تەنانەت بۆ ئەوانەش کە پێی نازانن،

درێغی مەکە.

وریا بن ، برِێ لە کتێب

فریوی منالْ و نەوەکانتان نەدەن ..

مەبەستم نووسەر و خاوەنی کتێبەکانە ...

یانێ بیر و هۆش و ئایدیا و تێروانینیان ،

بۆ مرۆڤ و ژیان .

مرۆڤی مەزن:

چاوەڕوان ناکات

ئەوانی تر دەرکەون و هاوکاری بکەن ..

بەڵکو ...

ئەو خۆی هەمیشە دەسپێشخەری هاوکارییە

بۆ دەوروبەری خۆی.

بەدڵنیاییەوە زوو یان درەنگ، شتێك یان کەسێك

ناخ و دڵ و گیانت داگیر دەکات ..

واتە خەیاڵ و کات و تەواوی هەستەکانت

دەخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە ...

دواجار ( ئەو )ە دەبێتە پادشا و مەلیك و

بەڕێوەبەری گشتیی

ناخی تۆ، هزری تۆ، هۆش و بیر و

گوفتار و ڕەفتاری تۆ ..

دەی ... ئیتر خۆت بپشکنە و ئەو داگیرکار و

ئەو پادشا و بەڕێوەبەرەی ناخ و دڵ و گیانت بناسە و

بزانە شایستەیی ئەوەی هەیە جڵەوی وجودت

بگرێتەدەست و

چۆنی بوێت وەها ئاراستەت بکات ؟!

هەرچی زووە، قارەمانانەی حەکیمانە

ڕووبەڕووی کێشە و دەرد و گرفتەکانت ببەوە ..

ئەوەی بنبڕیان دەکات:

ڕووبەڕووبوونەوە و دەست و دڵ بۆ بردن و هەنگاو

هەڵێنانە بۆیان،

نەک بەتەنها بیرلێکردنەوە و خەیاڵمەستبوون پێیان و

خەم و خەفەت خواردن لێیان و

تێپەڕاندنی کات و سات بەسەریاندا.

بۆیە زۆرینەی بوونەوەران

لەنەقصەوە بەرەو کەمال لە جووڵە دان ..

تا باوەڕی مرۆڤ بێتە سەر ئەوەی

کە هەم گۆڕانی ڕەگوڕیشاڵیی مومکینە،

هەم خودی گۆڕانەکەش

بە پلەبەندیی و وردە وردەیی دەگاتە ئامانج.

درۆ هەر ئەوە نییە

ناڕاستییەک بچرپێنی بەگوێی بەرامبەرەکەتدا ..

بەڵکو ستایش و پیاهەڵدانێکت دەربارە بگوترێت

کە لەحەقیقەتتدا بوونی نەبێت و،

لەبەرامبەردا هەڵوێستێکت نەبێت و بێدەنگی

دەربارە بنوێنیت،

ئەوا هەر درۆیە و

لەجیاتی زمان، بە بێدەنگییت درۆکەت کردووە.

مرۆڤی بچووک:

هەرخەڵک نا ..

هەر دۆست نا ..

تەنانەت خۆشی خۆشناوێت ...

وەلێ مرۆڤی مەزن:

هەر خەڵک نا .. هەر دۆست و بێگانە نا ..

تەنانەت ڕقی لە نەیارەکانیشی نابێتەوە.

کاتی بەنرخی خۆت:

بە خەم لە ڕابردوو .. بە خەیاڵ لە ئاییندە تێپەڕ مەکە..

لە ئێستات دا:

دارای ئیمان و ئیرادە بە ... بەئومێد و ئەویندار بە

... دڵپەیوەست بە ... پەیوەندیی سازگار بە ...

هۆشمەند و بیر ڕۆشن بە ... دەروونباڵا بە ...

کەسایەتی پتەو بە ... ئاشتەوای مرۆڤ و تەواوی

بوونەوەر بە ... هێمن و هێمنیی بەخش بە ...

ڕاستکار و ڕاستیی پەخش بە ...

قارەمان بە ...قوربانیدەرو تێکۆشەر بە ...

ڕزگارکار بە.

ئەگەر چی ئەو گاڵەگاڵ و غەڵبە غەڵبەی
لە وجوود بەرز دەبێتەوە
بەهۆی شەڕ و ئاژاوە و گێچەڵی مرۆڤەوەیە،
بەڵام دڵنیام ئەو ڕۆژەی مرۆڤ
لەماڵی خەلیقەت بچێتە دەرێ ..
یەکپارچە وەحشەت و غوربەت
سیمای بوونەوەر دادەپۆشێ.

ئەو شتانەی

بەهۆی ڕاستییەوە لەدەستیان دەدەیت ..

لە مرۆڤبوونت هەڵناوەرن ..

ئەو شتانەش

کە بەهۆی ناڕاستییەوە بەدەستیان دەهێنیت ..

کەسایەتیت سەنگین ناکەن ،

هیچ ڕەوشت و خەسڵەتێك

ئەوەندەی ڕاستیی ،

تۆ لەدڵی خەڵکیی نزیك و گەورە ناکات.

تۆ کە مرۆڤی،

یانێ کەموکوڕی لەکەسایەتیتا بوونی دەبێت و،

هەڵە لە ژیانتا دووبارە و چەندبارە دەبێتەوە ..

جا ئەو کەسەی ڕێنمایی بێژ و هاوکارە بۆ

کەمکردنەوەی هەڵەکانت ...

هەندێجار لەخۆت دڵسۆزترە بۆخۆت..

قەدرزانیی بکە و،

لانی کەم ڕێگر مەبە لەبەردەم هەوڵ و هیممەتەکانی.

وریابە دڵی هیچ مرۆڤێك نەشكێنیت ..

ڕەنگە زرینگانەوە و دەنگو صەدای

ئەو شكانی دڵە،

گوێچكەی هەموو بوونەوەر بهەژێنێ.

بەختەوەری لە کەسانی تر هەست پێ بکە ..

بەڵام هەرگیز

کەسانی تر بەسەرچاوەی بەختەوەریت مەزانە ...

دڵت بە ژیان خۆش کە ..

بەڵام هەرگیز

دڵت بە ژیان مەسپێرە ...

ڕێنمایی دۆستەکانت بکە ..

بەڵام هەرگیز

ناچار بە جێبەجێکردنی ڕێنماییەکانیان مەکە.

گوڵ: بۆن و بەرامە خۆشەكەی

لە تەواو خانەكانی بوون و پێكهاتییەتی ...

تا بچووكترین بەش لە وجوودیا مابێت بەخششی خۆی

لەبۆن و بەرامەی خۆش دەبەخشێت ..

تۆش چەشنی گوڵ ..

خەسڵەت و ڕەوشتە درەخشانەكانی چەشنی:

خۆشەویستی و صدق وصەفا و سینەصافیی و،

هیممەت بەرزیی و هەڵوێست و هاوكاریی و لێبوردەیی و

هێمنی و ئاشنایی و ئاشتەوایی، تێكەڵ بە كەسایەتی و

تەواو پێكهاتی مرۆڤبوونت بكە.

ئاگایی.. بەسەرمایەی ڕاستەقینەی ژیان و وجودت بزانە،

مرۆڤبوون یانیٚ:

هەستکردن بەتێپەڕینی کات و تەمەن بەوشارییەوە ..

بەچەشنێک کە بتوانی هەرشتێک بتەویٚ تیایدا ئەنجامی

بدەیت، ئیتر بە ویست و نەخشەی دڵ و دیدگای خۆت

ئەنجامی بدەیت،

تا زۆر تر لە سنووری ئەم ڕستەیەدا بخولێیتەوە

( من کێم و دەبیٚ چیبکەم ؟ )

زۆرتر لەناو چرکەساتەکانی زیندوێتی ڕاستەقینەدا

دەژیت و دەمێنیتەوە.

بێ هێز:

ئەو كەسە نییە

كە مافی خۆی پێ دەستەبەر ناكرێتەوە،

یان لەشەڕ لەگەڵ ئەوانی تردا دەدۆڕێت ..

بەڵكو بێ هێز ئەو مرۆڤەیە:

كە خوو و خەسڵەت و ڕەوشتێكی ناشیرین و

ناپەسەند و زیانبەخشی هەیە و،

ناتوانێ یان نایەوێ بنبڕی بكات و بیسڕێتەوە

لەناخ و لەژیانیدا.

تینوێتی ڕاستەقینە

بریتی نییە لە وشک بوونی قورگ و

نەبوونی ئاو بۆتەڕبوونەوەی دەمارەکانی لاشەی مرۆڤ..

بەڵکو بریتییە لە وشکبوونی دڵ و

دەسنەکەوتنی کانیاوی حەقیقەت و مەعنا

بۆ سوکنایی گیان و بۆ سەوزایی ژیان.

هەژاری فیکریی

بریتی نییە لەنەبوونی زانست و زانیاری

دەربارەی خودا و ژین و دین بەگشتی و،

مرۆڤ و پەیوەندییەکانی بەتایبەتی..

بەڵکو بریتییە لە هەبوونی هەموو ئەو شتانە و،

هەماهەنگ نەبوونی ناخ و کردەوەی و

ڕەنگنەدانەوەی هۆش و بیری لەژین و لە واقیعی

ڕۆژانەیدا.

هەژاریی:

ئەوە نییە نان و ئاو لەماڵتا نەبێت و

پارە و پووڵێک نەبێت پێویستییەکانتی

پێ دەستەبەر بکەیت ..

بەڵکو ئەوەیە:

هەموو ئەوانەت هەبێت،

کەچی نەبەخۆت لێیان بەهرەمەند بیت و

نە دەست و دڵیشت بچێتێ تا گیان و ژیانی

پێویستمەندانی پێ خۆش بکەیت.

هۆش و بیرم،

پارێزگاریم لێدەکەن تا ستەمم لێ نەکرێت .. و

دڵ و ویژدانیشم ،

پارێزگاریم لێدەکەن تا ستەم نەکەم.

هیچ نەبەخشیت،

باشترە لەوەی

ببەخشیت و ..

منەت کەیت بەسەر ئەو کەسەی

پێت بەخشیوە.

غەریب کەسێکە:

بەلانی کەم یادەوەری نییە، لەدڵی کەسێکا،

یان بەلانی کەم

کەسێك نەبۆتە یادەوەری

لەناخی ئەو دا.

بەگوفتار و، بەرەفتار و،

بەهەڵوێستە جوان و دروستەکانت

ببە بە یادەوەری شیرین و سەنگین و کاریگەر

لەژیانی هەمووان ..

تا هەرکات ڕۆیشتیت

بەزیندوویی بمێنیتەوە،

لەدڵی یار و نەیاران دا.

هەر شتێک

ڕێز و ڕەوشت و شکۆمەندیی مرۆڤ لەکەدار بکات و،

پێکهات و کەسایەتی بخاتە مەترسییەوە ..

ئەوا دوژمنێکی سەرسەختە و لەناو بردنی مرۆڤی

کردۆتە ئامانج ..

بۆیە ئەرکی سەرشانی هەر یەکێکمانە،

بەهەرچی هێز و توانای ماددی و مەعنەوییمانە

ڕووبەڕووی بینەوە.

ئیمان:

لە مرۆڤ و لەزەوی و لەهەرچی بوونەوەر و

لەهەرچی شتە دایبڕاندم و

دڵپەیوەستی ئاسمانی کردم ...

یانێ ڕزگاری کردم،

لەکۆیلەیی

هەرچی کەس و هەرچی شتە.

هەموو دەم

ئامادەی دەست و دڵ بەردان

لەبەشێك لە مافە ماددی و مەعنەوییەکانت بە ..

بەمە ئیتر

هەم مەحبووبی نێو کۆمەڵگا دەبیت و،

هەم کەمتر خەڵکت لێ دەرەنجێ و،

هەم دڵ و گیان و ژیانیشت سازگار و

سەلامەت دەبێت.

دڵە:

بەڕێوەبەری گشتیی ..

تەواوی فەرمانبەرانی

دائیرەی وجوودی مرۆڤ.

بە هەموو هێزت لایەنگیری ئەوەبە
کە حەق بۆ خاوەنەکەی بگەڕێتەوە ..
بەڵام زووتر:
خۆت حەقرەو و، حەقناس بەو
بشیناسێنە.

دووبارەو چەندبارە بوونەوەی هەڵە

خووێکی ئاساییە و،

خەسڵەتێکی هاوبەشە لەنێوان مرۆڤەکان و

پێی دەناسرێنەوە ..

وەلێ هەڵەی دووبارەو چەندبارە بووەوە

ڕەوشتێکی ناپەسەندە و ..

مرۆڤ: هەم لەسەر ئیرادەی دەکەوێت،

هەم کەسایەتی لاواز و ناشیرین دەکات.

نە هەر ڕازی مەبە بە ستەم ..

بەڵکو بەهەموو هێز و تواناشت ڕووبەڕووی بەوە ...

باشترین ڕووبەڕووبوونەوەش،

ستەم نەکردنی خۆتە لەنزیك و دوور،

لە خزم و بێگانەت،

یانێ دەبێ زووتر ستەم لەناخی خۆتا

لە ڕەگ و ڕیشە هەڵکەنی ..

تا ئەوە نەکەیت لەناوەوەتا،

ناتوانی لەدەرەوە ڕووبەڕووی ستەم ببیتەوە.

هەموو دەم

خەریکی هێمن کردنەوە و ئارامکردنی

ناخ و دڵ و گیانت بە،

چون: گوفتار و ڕەفتار و هەڵوێستەکانت

هەڵقوڵاوی ناختن ..

چۆن بێت لەناوەوە

وەها دەبێت لەدەرەوە.

دەبێ هەمیشە ئازا و ئازاد بیت ..

ئازا: یانێ بێ باک لەهەرچی و بێ نیاز لەهەر کێ،

پیادەی بیر و باوەڕت بکەیت ...

ئازادیش: یانێ هیچ کۆت و بەند و زنجیرێکی

ئارەزوو یا ترس یا خشڵ و زیو و فریو

نەتوانن هۆش و بیر و قاچ و دەست و دەم و

دیدە و دڵت گیربەند بکەن و

پەکی پەیمان و پەیوەندی و پەیامداریت بخەن،

لەگەڵ مرۆڤ و سروشت و تەواوی بوونەوەراندا.

مەحەببەت:

چەشنی ئاوێكی سازگار ...

دەڕژێتە نێو هەموو خانەكانی بوونی مرۆڤ و

سەرتاپای بوونی تینووشكێنی سوكنایی دەكات ..

ئومێد:

ئەو بارانە بە پیت و فەڕەیە ..

كە سارای وشك و برینگی مەحاڵ

دەكاتە سەوزەڵانی ژین.

گومانی خراپ:

وەك ئەو بەردە تیژ و خۆشرۆیە وایە

کە بەتوندیی دەیهاوێژییە گۆمێکی مەنگەوە ...

بە بەردەوام

بازنە و چەماوەی گەورە و گەورەتری

نا جێگیر و ناحەقیقی دروست دەکات ...

لەناخ و دڵ و گیان و ژیانتدا.

هەرچی مەخلووقە لە حەقیقەتیا

کەمال و جەمال نومایان بووە ..

وەلێ:

هیچ کامیان بەچەشنی مرۆڤ

حەقیقەت تیایدا نەدرەوشاوەتەوە.

كە دەزانم مرۆڤ هێندە مەزنە و

سەروەری بوونەوەرانە و

مەقصوودی وجوودە ..

ئیدی لە من گەڕێن..

كە ناتوانم ڕقی ئەو لەبەر هەر هۆكارێك،

لەدڵ بگرم.

بە تەنها بەس نییە

وەزیفەی کارمان بۆ بژێوی ژیان بزانین ...

ناسینی وەزیفەی مرۆڤبوونمان

لە نێو ئەم ژین و بوونەوەرەدا ..

گرنگتر لە هەرشتێکە.

لەسەر نەوت و، زێڕ و زیو و شتی تر نا ..

دەبوو شەڕی گەورەی جیهانیی و مرۆڤایەتی

لەسەر ( کات ) بووایە ...

چون شتێکی گرانبەهاتر لە کات ..

لەژینی مرۆڤ و ، لەم بوونەوەرەدا وجوودی نییە.

مەحەببەت لەتوانایدایە

بە مەحاڵ بڵێت:

بارگە و بنەت بپێچەوە ..

ئیدی شوێنێکت

بۆ مانەوە لەدڵی مرۆڤدا نەماوە.

شانازی بەو کەسانەوە بکە

کە دڵیانت گۆڕیی و ،

خستنتە سەر ڕاستە شەقامی حەقیقەت ..

نەوەک ئەوانەی لەسەر حەقیقەت ،

دەمکوتت کردن.

بەس نییە لە تۆوە زیان بەکەس نەگات . .

بەڵکو دەبێ:

ببیتە ئەو بەربەستە پۆڵایینەش

کە ( ئازار و زیان ) نەتوانێ وەها بەئاسانی

لەنێوان مرۆڤەکاندا

هاموشۆ بکات.

هەر شتێک

کە لەبەرزاییەوە بەرمان دەکەوێت ئازارمان دەدات ..

تەنها باران نەبێت ..

نەک هەر ئازارمان نادات،

بەڵکو دڵ و گیانیشمان پڕ دەکات

لە ئارامی و

لە ئومێد و ئەوین.

مرۆڤ بەجەستە و ڕووخسار و

بە شێوە و ڕووکەش مەناسە ...

بە دڵ،

هەم بە بیر و هۆشی پێناسەی کە.

زەمەن: هەرچەند ماشێنەکەی تیژ و خێرا

لێ بخورێت،

شوێن: لەهەرکوێی ئەم زەمینە وێرانەدا

نیشتەجێت کا،

بێ باک بە ، لەوان و لە هەرچی و لە هەرکێ ...

مادام چاوانێکت ساغن بۆ بینین و

گوێچکەت سازن بۆ بیستن و

هۆشێکی پڕ جۆشت هەیە بۆ بیرکردنەوەو

دڵێکی گەرموگەشیشت لە سینەیە

بۆ ئەویندار بوون.

ئەگەرچی

لە خوێن و گۆشت و لە نەسەبا

وەک هیچی تۆ نییم ..

بەڵام هەرکات پێویست بکات

وەک هەموو کەسی خۆت ڕەفتارم دەبینیت ...

هاوڕێ .

ئەویندار بوون:

یانێ توانەوە لە حەقیقەت دا ..

یانی تەجەللای حەقیقەت لە دڵ دا ..

یانێ بوون بە خودی حەقیقەت.

مرۆڤی مەزن

هەڵچوونی نەیارەکانی نایشڵەژێنێ و

تووشی پەرچەکرداری ناشایستەی ناکات ..

بەڵکو ئەو بەردەوام

بیر لە: هۆکاری هەڵچوونەکان و

بەنەیار بوونی بەرامبەرەکانی دەکاتەوە.

ئەو ڕێگایەی بەباوەڕەوە دەیگریت،

خواریش بێت هەر ڕاستە ...

کەچی ئەو وتەیەی بەقەناعەتەوە نایکەیت،

ڕاستیش بێت هەر هەڵەیە.

پاداشت و قەرەبووی تۆ

با ئەوە بێت:

هاوڕێكانت بە بەختەوەری ببینیت.

ڕاست بە ... مافپارێز بە ...
دادپەروەر بە ... ویژدان زیندوو بە ..
ئیتر لە هەر وەزیفەیەك دەبیت ، ببە و
خەم و ترسم نابێ لێت،
ئەی مرۆڤ.

نە بەکوژاندنەوەی چراکان

شەو دادێت و ..

نە بە هەڵکردنی مۆمەکانیش

ڕۆژ هەڵدێ.

ئەگەر ئادەمیزاد

بەو چەشنە زیندەگیی نەکات کە مەرجی مرۆڤبوونە ..

ئیتر ویژدان و ڕێز و ڕەوشت و شکۆمەندیی و

ماف و تەواوی بەها باڵاکان پێشێل دەبن و،

هەموو بوونەوەر دەکەوێتە بەر هەڕەشەو مەترسی

لەناوچوونەوە ...

ئەو دەمەش: ئەوەی لەهەمووان زیاتر و زووتر

زیانمەند دەبێت،

خودی مرۆڤ خۆیەتی.

لەوەتەی دەبینم ..

هەر جەنگاوەرە

خوێنی ئاڵی لێ دەڕژێت ...

هەر سەرکردەیە

چاوی کاڵی بەکل دەڕژێت.

قازانجی ڕاستگۆیی لەوەیدایە ..

وات لێدەکات هیچ کات شتی ناشایستە نەکەیت،

تا ناچار نەبیت

بەهانە و پاکانەی ناڕاستی بۆ بهێنیتەوە.

مێژووی تۆ،

بۆ نەوەی دوای تۆ،

ئەوانەن کە لە ئەمڕۆتدا دەیانکەیت ...

ئیتر بزانە

چی دەکەیت.

بەهاری ڕاستەقینەی مرۆڤ :

هاتن و دەرکەوتنی گوڵ و گوڵزار نییە ...

بەڵکو -

سوکنایی دڵ و گیان و

بەدیهاتنی ئاواتە ڕاستەقینەکانییەتی.

هەرکات توانیت

بەسەنگینی دڵ و گیان و،

بەڕاست و ڕۆشنیی بیر و هۆش و،

بەبەرزیی ڕێز و ڕەوشتت،

شیرینتر و خۆشەویستر بیت لەپارە و سامان

لەدڵی خەڵکی ..

ئەوە بزانە: کارێکت کردووە بەهەموو کەس ناکرێ و

بە ئاکام و پلە و پایەیەک گەیشتووی .

تەواوی دەوڵەمەند و دەسەڵاتدار و پادشاکان

بەدرێژایی مێژوو،

هەوڵیان بۆی داوە و پێی نەگەیشتوون.

وەختێ ستایشی خۆت

لەزاری خەڵکانی ترەوە بیست

پەنجەکانت بخە ناو گوێچەکانت و ... مەوەستە ..

وەلێ:

کە گوێبیستی کەموکوڕییەکانت بووی

دڵ و گیان و تەواوی هەست و هۆشتیان بۆ ڕادێرە ..

چون چاك کردنی ئەوانە .. کەسایەتیت پتەو و

دەرووندروستت دەکەن.

لە جیاتی ئەوەی

بیر لە گۆڕینی کەسەکان و کورسییەکان بکەنەوە ..

باشتر وایە:

بیر لە گۆڕینی

ناخ و دڵ و ... بیر و هۆشی

مرۆڤەکان بکەنەوە.

هەرچی لە تواناتە بیخە گەڕ

بۆ لەناو بردنی دوژمنەکەت ..

وەلێ بەکوشتن و

تێك و پێك شکاندنی کەسایەتی نا ...

بەڵکو بەگۆڕینی: بە دۆست.

لە منالیمەوە تا ئێستا ..

هەرچی هەمبووبێت

یان لێم کەوتووە، یان لێیان ستاندووم ...

تەنها ئازادی و ئومێد نەبێت،

لەمنالیمەوە تا ئێستا

نەلێم کەوتووە و

نە هێشتووشمە کەس لێم بستێنێت.

هەتا درکی جەفاتان

زیاتر و قووڵتر بچێتە دڵ و دەروونم و

ئازاری بەئێشتر بگەیەنێتە گیان و ژیانم ..

من زیاتر و زۆرتر دڵارام و خۆگر دەبم و ،

باوەڕم سوورتر دەبێت لەسەر پەیامی مرۆڤدۆستیم و

ئینتیمام بۆ ناتوندوتیژیی دووپات تر دەبێتەوە.

جیاوازی

کەسێکی گەشبین لەگەڵ کەسێکی ڕەشبین ..

تەنها:

هیوا و هیممەتە.

جاران مرۆڤ

گوفتاری بەس بوو بۆ متمانە پێکردنی ..

ئەمێستا دەبێ

ڕەفتاری لە ڕەهن دابێت.

ئەگەر هاتی بۆ دیدەنیم ..

لەگەڵ خۆت هەر مەحەببەت بێنە و

چیتر ... نا.

هەرگیز

مەرهەمی خەم،

مەدە لە برینی کێشە و گرفت و دەردیسەریی و

ئامانجە بەدینەهاتووەکانت ..

چون نە هەر سارێژیان ناکات،

بەڵکو ئازاریشیان کەم ناکاتەوە.

هەرچی دەیبینی

لەم زەوی و ژیانەدا بەرهەم و دەسترەنجی مرۆڤە و

زادەی دڵ و هۆش و بیریەتی ... و

لەو پێناوەشدا گەنجێتی پیر کردو، پشتی چەماندەوەو،

قژی سپی کرد بۆی ..

کەواتە مرۆڤ ماندووترین بوونەوەری سەر ئەم گۆی

زەمینەیە و، لەدیدە و دڵی هاوڕگەزی خۆیشی

بێ بەش ترین مەخلووقە لە ماف و ڕێز.

تۆ هەرکات و لەهەرکوێ

بەختەوەریت دەستکەوت،

ئەوە ئیتر هیوای منە بەدیهاتووە ...

منیش هەرکات و لەهەرکوێ ئازادییم دەسکەوت،

ئیتر لەوێ بەیداخی دەوڵەتی مرۆڤبوون هەڵدەکەم و

هەردووک پێکەوە ،

هاووڵاتیی ئەو نیشتمانە شکۆمەندە دەبین.

مادام مرۆڤـ

توانای تێرامان و، بیركردنەوەو، بەدڵگوێگرتنی هەیە ..

ئیدی هەموو دەم

گەشبینم بەگۆڕانی خێرمەندانەی.

ژیانت بەو چەشنەی هەیە خۆشبوێت و
زیندەگی ئارەزوومەندانەی تیادا بکە ..
نەک بەو جۆرەی
کە لەخەیاڵتا نەخشە و وێنەت بۆی کێشاوە.

ژیانت خۆش بووێت ..

دۆستایەتی مرۆڤ بە گەورە بزانە ..

ئاوەدانکردنەوەی زەوی بەئەرکی سەرشانت قبووڵکە ..

تێکەڵبوون بە سروشت و گۆڕینەوەی ڕاز و نیاز و

خزمەتی بێ بەرامبەری ئەو:

بە ناسنامەی مرۆڤبوونت هەژمار بکە ..

ئیتر ئەوانەن هۆکاری بەختەوەری ڕاستەقینە و

هەمیشەییت.

هیچ کات بۆ دیداری ئەوانە مەڕۆ،

کە شتانێکی ناشایستەیان دەربارەی تۆ

گوتووە یان کردووە و ..

لە ئێستادا: توانای ڕووبەڕوو بوونەوەو

سەیری ڕووخساری تۆیان نییە ،

نەبا بەهۆی بینینی تۆوە لەوە زیاتر نغرۆی چاڵی

شەرمەزاریی ببن ..

ئەوە بێت با: مەزهەبی تۆ.

مەزنیی مرۆڤەکان

لە قەدرزانیی دۆستایەتی و.. پاراستنی نهێنییەکان دا ..

ئەو کاتە بەدیار دەکەوێت

کە پەیوەندییەکانی نێوانیان بەشێوازێکی

ناتەندروست و نەخوازراو،

ڕوو لە پووکانەوە و پچڕان و ڕووبەڕووبوونەوەی

توند و تیژ دەکات.

وەختێ

بە دیدە و دڵی مرۆڤە مەزنەکانەوە:

( ئەوانەی چەشنی خۆری درەخشانن

بۆ شەوی تاریکی وجوود )

دەڕوانمە ژیان،

لەناخی خۆمەوە دەڵێم:

هێشتا دونیا خێری تیا ماوە و،

شایستە بەوەیە بەردەوام بێت.

مەحەببەت:

لەتوانایدایە هەموو بیرە جیاوازەکان

لەگەڵ یەک کۆ بکاتەوە ..

وەلێ مەرج نییە بیرە جیاوازەکان،

پێیان بکرێت

مەحەببەت لەنێو خۆیاندا بەرپا بکەن.

ئەوانەی دەتوانن بێ چاوەڕوانی پاداشت،
چاکە لەگەڵ خەڵکی بکەن و
هەوڵ بۆ ڕزگاریی و خۆشگوزەرانی و
دڵخۆشکردنیان بدەن ..
مرۆڤانیکی گەورەن و
شایستە بەوەن ببنە قوتابخانە:
بۆ باڵابوونی ناخ و، پتەو بوونی کەسایەتی و،
پێشەنگبوونی ڕاستەقینە.

خێزان

لە هاوسەرەكانیان ..

مەحەببەتیان گەرەكە ...

نە

مەعریفەت.

هەر یەکەمان

بە زیندەگیمان .. یاداشتنامەو چیرۆکی ژیانی خۆمان

دەنووسینەوە ....

هەندێکمان حیکایەتخوانی خوێنتاڵ و

هەندێکیشمان:

خوێنشیرینین.

ئەو تەقەیەی دوو دەستی نەرمی مەحەببەت

دەیدات لەدەرگای دڵ و گیان ..

نەکرانەوەی بۆ نییە ...

ئەگەر مەحەببەت لە دەرگای دڵمانی نەدا ..

ئەوە کەمتەرخەمی و بێ توانایی ئەو نییە ،

بەڵکو ئێمەین دەرگای دڵمان گۆڕیوە بە دیوار ...

ئازیزترین میوان ..

مەحەببەتە بۆماڵی دڵتان.

مەحەببەت:

ئەو موصلیحە حەکیم و میهرەبانەیە ..

کە مرۆڤ

بەخۆی و، سروشت و، تەواوی بوونەوەر،

ئاشت دەکاتەوە ...

خۆشویستنی هاورێکانم ..

لە پێشەوەی هاوکاری کردنیانە ... لام .

( منم کێشە .. نەک ئەوانی تر )

تەنها: بمانتوانیبوایە باوەڕ بەم ڕستەیە بێنین،

ئیتر ڕزگارمان دەبوو.

بێ نازان و، مەحروومان لە مەحەببەت
لەهەموو کەس نەخۆشتر و پەرێشانترن ..
وەلێ کەس هەستیان پێ ناکا و ...
کەس هاوار و حیرمانی رۆحیان
نابیستێ و نابینێ.

وەختێ یەکێک کێشەیەکی خۆییت دێنێتە لا،

بەوپەڕی دڵسۆزی و گەرموگەشیی و

پلان و گرنگی و بایەخپێدانەوە بەدڵ و دەمییەوە بچۆ..

ڕەنگە تۆ بۆ ئەو: دواهەمین ئومێد و پەناگە بیت و

بەهاناوە چوون و ڕێگەچارەی تۆ

ببێتە مایەی دووبارە هاتنەوە ناو ژیانی ئەو مرۆڤە و

جارێکی تر دەستکردنەوە بەچاندنی تۆوی هیواکانی

لەکێڵگە و زەوی دەروونیدا.

دونیا:

لە تێپەڕینی شەمەندەفەرێک دەچێت ..

کە لەهیچ کام لە وێستگەکان ناوەستێت

تا

سەرنشینی بین.

ئیمان:

نیشتنەوەی باڵندەی باڵشەکەتی دەروونە ..

لە هێللانەی دڵارامی دا.

مرۆڤـ :

بوونەوەرێکی بە بەختە ..

بەڵام

هەرچەند بلێی سەختە.

ژیان:

بۆ مرۆڤی ڕەشبین و بێ ئیرادە ..

وەك ئەو قوتابییە تەمبەڵە وایە

کە حەز بەچارەی مەکتەب و کتێب و مامۆستا ناکات.

ئەوەی

لەم بوونەوەرەدا، لەهەمووشت بەنرخترە: مرۆڤە ..

کەچی ئەوەی

لەم سەر زەوی یەدا،

لەهەموو شت بێ ناز تر و بێ بایەخ تر

سەیری دەکرێت ...

بەداخەوە ... مرۆڤە.

بەدوای بەختەوەریدا دەگەڕێیت ؟!

دوور مەڕۆ ... هەر لەماڵەکەی خۆت،

نزیکتر ... هەر لەدڵی خۆت ..

بڕیاردە کە زیانت بۆ مرۆڤ و هیچ هیچ

بوونەوەرێک نەبێت ..

تەنانەت دار و بەرد و گژو گیا و ئاژەڵ و

باڵندەکانیش ...

ئیتر بەمە: پارێزراو، هەم بەختەوەریش دەبیت ...

ئەوە بێت با: مەزهەبی تۆ .

ئەگەر نەشتوانم هاوکاریتان بکەم،

لانی کەم دەتوانم :

خۆشتانم بوێت .

لە سنووری خۆتا ..

هەر کەسێک و لەهەرکوێ هەڵەیەکی کرد،

ئۆباڵەکەی بخە ئەستۆی خۆت ...

کە بۆچی نەتتوانیوە تا ئێستا،

بە ڕەفتار یان بە گوفتارت ..

پەیامی چاکسازی و مرۆڤپارێزی

بگەیەنیتە گوێچکە و، هۆش و بیر و،

دڵ و گیانی ئەو کەسە ...

ئەوە بێت با: مەزهەبی تۆ .

هیچ شتێکت لە هیچ کەسێ داوا نەبێت،

هەموو شتێکت بۆ هەموو کەسێ پێ ڕەوا بێت،

تا گەیشتن بە نەویستنی ( هیچ ) لە هیچ کەسێ

زۆری دەوێ،

تا بەخشینی ( هەموو ) بە هەموو کەسێ

مەودایەك هەیە،

وا بژی کە هیچت نەوێت،

وابە، هەموو شتیان لێت بووێت ..

ئەوە بێت با: مەزهەبی تۆ .

ئیتر نۆرەی شۆڕشکردنتە،

شۆڕشی ئاشنایی و ئاشتەوایی،

شۆڕشی گفتوگۆ و تەبایی و لێبوردەیی و پێکەوە ژیان،

ئیتر با لەجیاتی خوێن،

خەندە لە لێو و دڵ و گیان و

سەرتاپای ژیانی مرۆڤ دابچۆڕێ ...

ئەوە بێت با: شۆڕشی تۆ ..

ئەوە بێت با: مەزهەبی تۆ .

هەرچی هەوڵ و هیممەتتە بیخە گەڕ
بۆ بەختەوەر کردنی بەرامبەرەکانت،
کەمەکەی ئەوەیە:
بهێڵە قسەی دڵی خۆیانت بۆ بکەن ..
زۆرجاران، هەرتەنها بە ڕێگەدان بەبەتاڵکردنی
ناخیان و دەربڕینی ڕاز و نیازییان ..
گەورەترین خۆشحاڵییان پێ دەبەخشیت ،
ئەوە بێت با: مەزهەبی تۆ .

هاتە لات ... تۆش بچۆرە لای،

نەهاتە لات ... تۆ بێ شومار و بێ بەرامبەر بچۆرە لای،

پەیوەندی لەگەڵ پچڕاندی ... تۆ وەك ئەو نا ..

ئیتر هەر بچۆرە لای،

دەری کردیت ... چارەیەکی ترت نییە

هەمدیسان بچۆرەوە لای،

خۆ گەر شەڕی لەگەڵ کردیت ... ئیتر

پێ لەجەرگی خۆت نێ و،

هەمدیسان و هەمدیسانیش بچۆرەوە لای ...

ئەوە بێت با: مەزهەبی تۆ .

وەختێ یەکێک لەجاری یەکەمیا ئازارت دەدات،
بێدەنگی هەڵبژێرە و قووڵ بیر لەهۆکارەکەی بکەرەوە ...
وەختێ بێ هیچ پاساوێکی تەندروست
لەجاری دووەمیا ئازارت دەدات،
خەندە بخە سەرلێوانت
کەخاوەنی وەها دڵێکی خۆڕاگری بۆ نەنواندی
هەڵوێستی ناشایستە،
وەختێ ناجوامێرانە لەجاری سێیەما ئازاردانت
دەکاتە خەسڵەتی شەڕانگێزیی خۆی،
ئیتر بهێڵە فرمێسک ڕیز ببەستێ لە دیدە و دڵ و گیانت،
کە ئیتر گۆڕینی ناخ و دڵ و گیانی کەسێکی تری توند
سروشت بووە ئەرکی سەرشانی تۆ..
ئەوە بێت با: مەزهەبی تۆ.

گەورەبوونی منالێکت بە پلە بەندیی و وردە وردەیی
بەبەرچاوتەوە .. قبووڵە،
فێربوونی پیت و وشە و ڕستە و ژمارەکان و زانستەکانت
بەتەدریج .. لای مرۆڤ قبووڵە، تێپەڕینی وەرزەکان و گۆڕانی
هاوین بەبەهار و زستان بە پایزت حەفتە لەدوای حەفتە ..
قبووڵە، گەشە و نەشونمای گژو گیاو نەمام و درەختەکانت
ڕۆژ لەدوای ڕۆژ .. قبووڵە،
ڕۆشنبوونەوەی شەو و گەیشتن بەڕۆژ و ڕووناکایت
سات لەدوای سات .. قبووڵە،
کەواتە: گەشە و گۆڕانی ناخ و دڵ و گیان و ژیانیشت
بەپلەبەندیی، لە نەقصەوە بەرەو کەمال و
لەشەڕەوە بەرەو خەیر و.. لەنەهامەتییەوە بەرەو بەختیاری
و.. لەکاڵفامییەوە بەرەو ڕوشد قبووڵکە .

ئەو پەیامەی پێشکەشی کۆمەڵگای دەکەیت .. با
گەرموگەش، چارەساز، هەم تازە بێت ...
هەر ڕووکەش نا، مەعنا و مەغزا و ناوەرۆکیش ..
خۆشت نموونەی کردارەکیی بە بۆ پەیامەکانت ..
یانیْ دەنگ و ڕەنگیان دابێتەوە لە ژیانتا،
دڵسۆزییشت لەلوتکە بێت بۆ گەیاندنی پەیامەکانت و
هەوڵ و هیممەتت بۆ گۆڕینی ناخەکان،
هەموو ئەوانە هۆکارن بۆ: بەنموونە بوونی خۆت و ...
دەرکەوتن و سەرکەوتنی پەیامەکانت و،
گۆڕانی خێرمەندانەی دڵ و گیان و
ژیانی تاك و کۆمەڵگا ...
ئەوە بێت با: مەزهەبی تۆ .

تۆ یەک جار دەژیت و تەمەنێکی دیاریکراویش

زیندەگیی دەکەیت،

ئیتر ئەو یەک جار ژیان و تەمەنە دیاریکراوە

هەر بەشی ئەوە دەکات ئەزموونی خۆناسیی بکەیت..

کەواتە چرای ئەوین و ژیاندۆستی بگرە مشت و

بە سەرنجەوە بڕوانە دانە دانەی ئەو شتانەی

لە بوونەوەردا هەن و

لەدەوروبەرتا چەشنی کتێب بۆ ڕێنماییت کراونەتەوە ..

ئەوە بێت با: مەزهەبی تۆ.

ئەگەر هەمووان کۆک بوون لەسەر ئەوەی

کە مرۆڤی درِندە شایستە بە دۆستایەتی نییە و،

سزا و .. پچڕانی پەیوەندی چارەی دەردی دڵی ئەوە،

تۆ بەتەنها: گفتوگۆ بەچارەسەر بزانە ...

چون مرۆڤ ئەو بوونەوەرە سەراسیمەیە

کە بەهۆی گفتوگۆوە نەبێت،

بەهیچ شتێکی تر ناگۆڕێت.

ئەوە بێت با .. مەزهەبی تۆ.

وەختێ یەکێک ئازارت دەدات،

ئازار بچێژە ...

وەلێ لەبەرخۆت نا ..

بۆ دڵی ئەو!

کە بۆچی گەیشتۆتە ئەو ئاستەی

ئازاردانی دڵی مرۆڤی لا ئاسایی بێت!؟

ئەوە بێت با: مەزهەبی تۆ .

بۆ گەیشتن بە بەختەوەری و دڵارامیت،

هەر هەوڵ و هیممەت و بڕیار ... نا ..

بەڵکو:

ڕێگا و ئاراستەیەکی دروستیشت

پێویستە .

بەدەم ئاوەوە ... نا ..

چاکە بکە و

بیدە بەدەم ئایندەوە .

بە نائومێدیی بڵێن :

کەسێك هەیە ..

نایەوێ سڵاوی وەرگرێتەوە .

ئێوە کە :

پەرژینێک.. قەڵغانێک.. دەرگایەکتان نییە،

بۆ ماڵی دڵتان ..

ئیتر گلەیی لە بەلێشاو هاتنە ژووری خەم مەکەن،

بۆ نێو خانەی ژیانتان .

ئەو شتانە نا :

کە لەتواناماندا نییە ئەنجامیان بدەین و

دەستیان بخەین ..

بەڵکو: هەر تەنها ئەو شتانە بکەین

کەپێمان دەکرێت و تا ئێستا نەمان کردوون،

هەرچەند بڵێی:

ژیانمان ... هەم دڵ و گیانمان،

باشتر و ئاسوودەتر دەبێت .

چ ڕەنگێک ... نا ..

گرنگ ئەوەیە: چ سەنگێکت هەیە ؟!

چ کەسێکی ... نا ..

گرنگ ئەوەیە: چ کەسایەتییەکت هەیە ؟!

چەند دەژی ... نا ..

گرنگ ئەوەیە: چۆن دەژی ؟!

بە خەم بڵێن ..

من: لە دڵما

شوێنێکم بۆ هاتنە ژووری ئەو

بەتاڵ نییە.

ئەگەر نەشتوانی

پارێزگاری لەدڵی خۆت بکەیت

بۆ نەشکان بەدەست و دەم و تیر و توانجی خەڵکی ..

ئەوا لانی کەم

پارێزگاری لەنەشکانی شووشەی دڵی خەڵکی بکە،

بە دەست و دەم و تیر و توانجی خۆت ..

کە ئەوەیان لەژێر ویست و دەسەڵاتی خۆتایە .

هەر کات بمەوێ

لەپاشەملە باسی یەکێک لە دۆستانم بکەم ...

بە ناشیرینی ..

ڕەنگ بەڕووخسارمەوە نامێنێ ...

چون هەست دەکەم:

خەریکە خیانەتێکی گەورە لەو کەسە دەکەم

کە ئەو هێشتا ناوی منی

لەلیستی هاوڕێ و هاودڵانی خۆی هێشتۆتەوە .

دڵی ئارام ... باشترە لە: دڵی نیگەران ..

دڵی نیگەران ... باشترە لە: دڵی بێ سۆز ..

دڵی بێ سۆز ... باشترە لە: دڵی تاریک ..

دڵی تاریک ... باشترە لە: دڵی ڕەق ..

دڵی ڕەق ... باشترە لە: دڵی مردوو ..

دڵی مردوو ... باشترە لە: دڵی دڕندە .

چەشنی خۆر بە،

ڕۆشن .. هەم گەرم .. بۆ هەمووان ...

چەشنی حەقیقەت بە،

بێ نیاز لە هەرچی .. بێ باك لە هەر کێ ...

چەشنی سێبەر بە،

فێنك .. بۆ هەمووان .

بهێڵە تاوانباریش قسەی خۆی بکات،
نەوەک عوزر و پاساوێکی دڵڕازیکەری
بۆ هەڵە و تاوانەکەی هەبێت.

بهێڵن مەحەببەت ..

قسەی خۆی بكات ..

چون كاریگەرترین ڕستە بۆ سەر دڵ

ئەوە دەیكات.

هەموو دەرگایەك

کلیلی تایبەت بەخۆی هەیە،

تەنها خۆشەویستیی نەبێت ..

ئەو کلیلەیە

کە دەرگای هەموو دڵەکان دەکاتەوە.

متمانە

بە پەیمانی کەسێک مەکە،

کە کاتەکانی ژیانی .. ڕێک نەخستووە.

متمانە

بە دڵی کەسێک مەکە،

کە هێشتا بەسەر زمانیدا زاڵ نەبووە.

ئەوان: حەز دەکەن گوفتاریان ..

پیشکەشی کۆمەڵگا بکەن ...

من: ڕەفتارم ....

ئەوان: جەستەیان دەدەنە بەر شنە با ..

من: ویژدانم ...

ئەوان: دەست و چاویان دەشۆن ..

من: حەز دەکەم دڵ و گیانم ..

ئەوان: حەزدەکەن ڕۆژانە ددانیان پاکژ کەنەوە ..

من: زمانم.

بۆ داگیر کردنی دەوڵەتی مرۆڤ،

بردنی مەحەببەت ... لەگەڵ خۆت

لە بیر مەکە.

گۆمی مەندی وجوودت

بەبەردی پرسیارێک بشڵەقێنە و،

بڵێ: بۆچی لێرەم ؟

پێنووسی بەرپرسیارێتی بگرە مشت و،

لەسەر تەختەی هۆش و بیر و خەیاڵ و دڵ و گیانت

بنووسە: دەبێ چی بکەم ؟

شەوی تاریکی زیندەگی

بەچرای پەیام و پێشەنگیی ڕۆشنکەوەو

بفەرموو: ئەی مرۆڤ من لێرەم .

باوکێکی حەکیم وەها ئامۆژگاریی دەکرد،

کوڕی شیرینم: بۆ سەیر نەکردنی نامەحرەم

داوا مەکە ئافرەتان خۆیان داپۆشن و نێنە بازاڕەکان.

یان خۆت لەماڵ گیربەند و گۆشەنشین بکەیت،

ئەصڵی کێشەکە لەناخی خۆتە ..

چارەسەری دەروون و دیدگا و چاوانی خۆت بکە و

ئیتر لە هەر کوێ دەبیت ... ببە .

به ویقارەوه

هەنگاوی سەنگینی ڕەوشت

بەرەو قەڵای

چەشنی پۆڵای ..... مرۆڤبوونت،

هەڵگرە.

لێبوردەیی:

یانێ دوای ئەوەی مافی ماددی و مەعنەویت

پێشێل یان زەوت دەکرێت،

لەبەرامبەردا، نەک هەر هیچ هەڵوێستێکی

ناتەندروست نەگریتە بەر و

ڕووبەڕووبوونەوەی ناشایستە نمایش نەکەیت،

بەڵکو لە دەروونیشتا ڕق و کینە هەڵنەگریت و

هیچ پلان و پیلانێکیش بۆ تۆڵەسەندنەوە لەنەیارەکانت

... لە ئایندەدا،

لەهۆش و بیرتا نەخشەکێش نەکەیت.

شمشێر:

دەتوانێ تەنها جەستە داگیر بکات،

وەلێ وشە:

لەتوانایدایە دڵ و گیان و

عەرش و قورشی مرۆڤ بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە،

بێ ئەوەی دڵۆپێک خوێن بڕژێنێت.

ئەو دووانەی مشتومڕ کەوتۆتە نێوانیان و

هەریەکەیان بەڵگەی خۆی نمایش دەکات ،

بۆ لەسەر حەق بوون و

دەستەبەر کردنەوەی مافی خۆی،

لەبیریان چووە کەحەق بەهەرلادا بکەوێت

هەر زیانمەندن

چون ئەوەی پێشێل بووەو، ئاسان دەستەبەر ناکرێتەوە

مافی ئەم یان ئەوی تریان نییە،

بەڵکو صوڵح و تەبایی و دۆستایەتی ڕاستەقینەی

نێوانیانە.

وەختێ مرۆڤێکی

هێمن و لێبوردە و ناتوندو تیژ دەبینم ..

بەمن بێت دەست و دڵی ماچکەم و

بەسەرسامی و شانازییەوە لەخزمەتیا دابنیشم،

چون دەزانم:

چ مرۆڤێکی باڵا و کاریگەرە و،

چ کۆششێکی ڕەگوڕیشاڵیی لەگەڵ دڵ و گیانی

خۆی کردووە .

بهێڵن لێبوردەیی،

چەشنی ئاوێكی سازگار

برژێتە ژێر نەمامەكانی بوونتانەوە ...

تا هەمیشە میوەی دڵارامیی

بە لقەكانی مرۆڤبوونتانەوە شۆڕبێتەوە .

ئەو کەسەی دوای دڵزویر بوونیش ئامادە نییە نهێنییەکانت ئاشکرا بکات،
یان مرۆڤێکە: دەست و دڵی لەهاوڕێیەتییت بەرنەداوەو هیوای بەگەڕانەوەت هەیە،
یان کەسێکە: خۆشەویستی ڕاستەقینەی بۆت هەیە لەناخەوە ..
یان مرۆڤدۆستێکی دەروونباڵایە و، بەهیچ شێوەیەک حەز بەشکست و کەموکوڕیت ناکات ...
لە هەر سێ گریمانەدا، ئەو کەسە مرۆڤێکی مەزنە و، شایەنی ڕێز و خۆشەویستی و لەدەستخۆ نەدانە.

مرۆڤی بچووك و ڕق لە دڵ،

هەمیشە تاوان و تۆمەتی گەورە دەخاتە پاڵ

نەیارەكانی،

تا بتوانێ: پاكتاوی بیر و ئەندێشە و ..

تەنانەت ژیان و گیانیشیان بكات.

تاڵ نا،

حەق: شیرینە.

دەشێ

حەق بێت و، نەرمیش بێت.

درەختی مەحەببەت ..

چوار وەرزە گەڵاکانی سەوزە و،

بە هەمیشەش:

میوەی گوێڕایەڵی دەگرێت.

هاوڕێی خراپ،

وەك ددانی کلۆری ژانبەخش وایە ...

نە دەهێڵێ بخەویت و،

نە تام و چێژ لە خواردن و خواردنەوە بکەیت ..

لە هێمنی و بیرکردنەوەش هەر مەپرسە،

چونکە ناتبن.

مرۆڤ:

ئەی ماندوو ترین مەخلووق بەدوای ژیان و

خۆشنوودی!

ئەی بێئاگاترین بوونەوەر

لە حەقیقەت و توانست و ئەرک و فەرمانی

مرۆڤبوونی خۆت!

قفڵ لە دەست و قاچم بدەن قەینا،

لە گوێچکە و چاو و زمانیشم هەروا ..

وەلێ:

لە بیر و بینشم

هەرگیز ... نا.

یەکێک

لە چاکەکانی ئیمان بەسەرمەوە ئەوەیە کە:

ترس و

خەمی

لە دڵ نەهێشتووم.

هەمیشە

ئەو خەونانەی

دوای ئازاردانی خەڵك دەبینرێن،

ناخۆش و دڵهەراسانكەرن .

ئەو ئازارەی

بەهۆی هێمنی و لێبوردەییمەوە دەیچێژم ،

لام شیرینترە

لەو دەستکەوتەی

بەهۆی کێشە و ناتەبایی و توندو تیژییەوە ،

بەرچنگم دەکەوێت .

جەستەت نەخۆش بێت،

باشترە لەوەی

بیر و بۆچوون و بەرنامەت نەخۆش بێت .

هەرچی دەبیت ببە،

بەڵام پابەندی

ئەو ڕێنمایی و بەرنامەبە کەباوەڕت پێی هێناوە ..

یانیٚ :

ڕەفتارت هەماهەنگی

ئەو یاسا و ڕێسا و خاڵ و بەندانە بکە

کە لات پیرۆزن .

وەرن هەرچی زووە:

کار لەسەر زیندووڕاگرتنی شعوور بەزات و ژیان و مـرۆڤ بکـەین و بەهـەموودەم شـکۆمەندیی مـرۆڤ لەسـەرووی هەرچەشنەشتێکی ترەوە دابنێین، چون مرۆڤ مـەخلووقێکی تـابڵێی گـرنگ و کاریگـەر و شـکۆمەندە و، دەبـێ ئـەو سـەنگینییەی هەمیشـە بـەپارێزراوی بمێنێتـەوە، ئەوانـەی کـارو هـەوڵ بـۆ شکۆمەندهێشـتنەوەی ئـەو مەخلووقـە شەرەفمەندە دەدەن لەمێژوودا مرۆڤگەلی جوان و دلێـر و میهرەبـان و قارەمـان و مـەزن بووینـە و، لـەدڵی نـەوە و سەردەمی خۆیان و تەواوی مێژوو بەنەمریی و بەزیندوویی ماونەتەوە، خۆشحاڵ ئەوانەی لەوکاروانەدا لەهەنگاوناندان و، ڕێبواری ئەو ڕێگا درەخشان و لێوانلێو لە عیشق و صدق و صەفایەن .

درەوشانەوەی دەروون ئەوكاتە دەست پێدەكات

كە مرۆڤ وشیار دەبێتەوە بە حەقیقەت و

بەئێستای خۆی،

ئەگەرچی لەرووكەشدا شیكردنەوە و پێناسەكردنی

چەندێتی و چۆنییەتی خۆی

ئازارێكی ویژدانیی بەرپادەكات لەقووڵایی و

لەرەگوریشاڵی ئەو ناخ و دڵ و گیانەدا ..

بەڵام دواجار هەرخودی ئەو ئازارە تەكانێكی پڕ

لەهیممەتی مرۆڤپەروەرانە بەو دەروونە دەدات و

بەچەشنێك ئاشنا و شەیدا بەحەقیقەتی دەكات و

هەنگاوی پێهەڵدەگرێت

كەهەرچی ئازارە لەبیری بباتەوە و تەواوی ژین و

ئایندەی پڕاوپڕ بكات لەخۆشنوودی و بەختەوەری .

مرۆڤی بچووک:

وەختێ ستەمی لێ بکرێت زیادەڕەوی دەکات لە تۆڵەستاندنەوەی خۆی،

مرۆڤی ئاسایی: وەکو خۆی تۆڵە وەردەگرێتەوە وەختێک ستەمی لێ بکرێت،

مرۆڤی مامناوەند: لەبەر لەدەستنەچوونی بەرژەوەندییەکانی تۆڵەی خۆی وەرناگرێتەوە،

مرۆڤی دەرونسازگار: دەستبەردەدات لەوەرگرتنەوەی تۆڵەی خۆی، بەرخاتری سازیی دڵی خۆی،

وەلێ مرۆڤی مەزن و پەیامدار: نەک هەر تۆڵەی خۆی وەرناگرێتەوە، بەڵکو هەرچی لەتواناشیدا بێت دریغی ناکات بۆگۆڕینی دڵ و گیان و هۆش و بیری ستەمکارەکە، تا بنبڕی ستەم بکات لەناخ و ژیانی ئەو و، کۆمەڵگاش بحەسێنێتەوە لەزیانەکانی ستەم و ستەمکاران.

مرۆڤی مەزن :

وەختێ لەگەڵ تاوانبارێک دەوەستێت و گفتوگۆ و ئامۆژگاریی دەکات، نەک هەر وەک تاوانبارێک لێی ناڕوانێت، بەڵکو ناهێڵێ خودی تاوانبارەکەش درک بەوە بکات کەئەو بە چەندێتی و چۆنییەتی تاوانەکانی ئەو ئاگامەندە،

کەچی مرۆڤی بچووک :

وەختێ گفتوگۆ لەگەڵ کەسێکی چاک و پاک و ویژدان زیندوو دەکات، بەچەشنێک هەوڵی بچووککردنەوە و کەسایەتی شکاندن و تۆمەت خستنەپاڵی دەدات ..

وەک ئەوەی تاوانبارێکی دەستسووری دڵوێرانی لەبەردەمی خۆی ڕاگرتبێت، ئەو بەم وەهمەی لەهەوڵی هاوسەنگکردنی دەروونی تاریکی خۆی و ویژدانی ڕۆشنی ئەودایە، بێ ئاگا لەوەی، حەقیقەت خۆری درەخشانی مەعریفەتە و بەبێژینگی نادانیی بەری لێناگیرێت و پەردەپۆش ناکرێت.

# Man

## The dignified creature

مرۆڤبوون :
چەندە تەشریف و ڕێزلێنانە ،
ئەوەندەش
تەکلیف و ، بەرپرسیارێتییە .

کۆمەڵە پەیامێکی کورتن :
بۆ سازگاریی دڵەکان ،
بۆ ڕێکخستنەوەی پەیوەندییەکان ،
بۆ شکۆمەندهێشتنەوەی مرۆڤ .